(رسالة)

# حكم تكفير المعين

# والفرق بين قيام الحجة وفهم الحجة

## به كوردى


نوسينى

الشيخ إسحاق بن عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب

(1276 – 1319) كۆچى

وەرگێڕانى

باوكى بێگەرد پێنجوێنى

# بسم الله الرحمن الرحيم

## الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله، أما بعد:

بەهۆی ئەم غوربەتەی ئیسلام و موسڵمانان تێیکەوتوون، بە تایبەتی ئەو موسڵمانانەی کە خاوەنی عیلمن و تێدەکۆشن بە زمان و ماڵ و گیانیان بۆ بەدیهێنانی تەوحید و پاراستنی تەوحید لە هەڵوەشێنەرەوەکانی، تەوحید بۆتە گەورەترین خەمی ژیانیان بۆ تەوحید دەژین و دەمرن، وە هەر بۆ تەوحیدیش دروستکراون، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} {الذاريات : 56}.

(البغوي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: (ابن عباس رضي الله عنه) فەرموویەتی: هەر شتێک لە قورئاندا هاتبێت بە ناوی (عبادة) ئەوا ماناکەی (تەوحیدە).

وە هەر لە تەفسیری (البغوي)دا هاتووە کە (ابن عباس رضي الله عنه) لە تەفسیری ئایەتی (21)ی سورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: (اعبدوا ربكم : واتا وحدوا ربكم).

(بوخاری)ش لە صەحیحەکەیدا لە (كتاب التفسير) لە تەفسیر ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ: (إلا ليعبدون : واتا إلا ليوحدون).

ئەمەش ڕوونە لەلای هەر موسڵمانێکی (موحد) کە ووشەی (عبادة یان اعبدوا) چ لە قورئاندا وە چ لە سوننەتدا بەمانای تەوحید دێت، ئەوەتا دەبینین الله تعالى لە چەندەها شوێنی قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: (اعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا)، وە هەروەها کە باسی چیرۆکی پێغەمبەران دەکات (عليهم الصلاة والسلام) هەموویان بە قەومەکانیان ووتوە: (يا قوم اعبدوا الله ما لكم من إله غيره)، وە هەروەها پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" لە زۆر فەرموودەدا فەرموویەتی: (اعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا)، ئایا دەکرێت بڵێین لەم هەموو دەقانەدا ووشەی (عبادة یان اعبدوا) بە مانای تەوحید نایەت بەڵکو تەنها بە مانای عیبادەت کردنی وەکو نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و ئەمانە دێت، هەروەک زۆربەی خەڵکی بەناو موسڵمانی ئەم سەردەمە واتێیگەیشتووە ؟ مەگەر کەسێک ئەلف و بێی تەوحید نەزانێت وابڵێت، جا چ پەرستنێک لە تەوحید

گەورەترە ؟ ئەم شتەش لە زمانی عەرەبیدا ڕوونە، وەنەبێت لادان بێت لە زمانی عەرەبی کە زمانی قوڕئان و سوننەتە، چونکە ووشەی (معبود) واتا پەرستراو بە مانای (مألوه = إله) دێت، بۆیە لە زاراوەی شەرعیدا زۆرجار لە بڕی تەوحیدی ئولوهیەت زانایان دەڵێن تەوحیدی عیبادەت.

کەواتە الله تعالی دەفەرمووێ: (جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ بەیەکدانانی من (لیوحدون) نەبێت بە تەنها و بەبێ هاوبەش دانان بۆم).

وە بەهۆی ئەوەی کە یەکێک لە سەرەکیترین واجباتەکانی ئیسلام کە تەکفیرە زۆر غەریب بووە و ناشرین کراوە و بە تاوان دانراوە و کراوەتە شتێکی مەحاڵ، ئەوەی جێبەجێی بکات بە دروستی وەکو ئەوە وایە پشکۆی ئاگری بەدەستەوە گرتبێت (کما قال علیه الصلاة والسلام)، کە بەهۆی ئەمەوە زانایانی ڕاستەقینەی ئیسلام و موجاهیدان و موەحیدان بە گشتی کراون بە خەواریج و نەفام و توندڕەو و نەزان ...هتد، وە زانایانی ئەهلی کوفر لە سەرووی هەمووشیانەوە بانگەشەکارانی سەلەفیەت (أدعیاء السلفیة) کراون بە زانایانی ئەهلی سوننە و شوێنکەوتووی سەلەفی صالح، لە کاتێکدا ئەمانە توشی (جەهلی مورەکەب) بوونە واتا جاهیلن و کەچی ناشزانن جاهیلن، زۆرێکیان بە حیسابی خۆیان ڕەددی ئەهلی بیدعە دەدەنەوە و دژایەتییان دەکەن وەکو صۆفی و ئەشعەری وماتوریدی موعتەزیلی و قەدەری و جەبری و مورجیئە و جەهمی...هتد، کەچی بێئاگان لەوەی خۆیان کەوتوونەتە ناو یەکێک لە گەورەترین بیدعە موکەففەرەکان (بیدعەی مفسق و مکفر هەیە، کە مفسق خاوەنەکەی فاسق دەکات، وە مکفر خاوەنەکەی کافر دەکات)، کە ئەویش بیدعەی کوفری جەهمیەکانە کە بە (مرجئة المتكلمين یان غلاة المرجئة) ناسراون، کاتێک فتوای زانا هەرە گەورەکانیان دەخوێنیتەوە دەربارەی بابەتی (کوفر و ئیمان) وادەزانی فتوای (جهم بن صفوان) دەخوێنیتەوە بەڵکو هەیانە کوفرەکەی گەورەتر و فراوانترە لەهی (جهم بن صفوان)، جا ئەمە حاڵی زانا گەورەکانیان بێت کە لەلای ئەوان حوجەجەن ئەی دەبێت حاڵی زاناکانی تر و قوتابیەکان و عەوامەکانیان چۆن بێت !!! هەروەک کە (المأمون)ی خەلیفەی عەباسی پرسیاری لە زانا (نضر بن شميل) کرد ئایا (الإرجاء) چیە ؟ ئەویش ووتی : دینێکە بە دڵی دەسەڵاتدارانە، دونیای پێ بەدەست دەهێنن و لە دینیان کەم دەکەنەوە. مەئمون وتی : ڕاستت ووت. منیش پڕ بە دڵم بە (نضر بن شميل) دەڵێم ڕاستت ووت، سەیرکە ئەوەی ئەهلی ئیرجائە ڕێزلێگیراوە و سەلامەتە و لە ئەمن و ئەمان دایە، ئەوەشی کە ئەهلی سوننەیە و موەحیدە لە گۆڕستان و بەندینخانە و ترس و ناڕەحەتی و مەینەتی دایە، جا بۆیە بە پێویستم زانی ئەم نامەیەی شێخ (ئیسحاق) وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی کە باسی حوکمی تەکفیرکردنی کەسی دیاریکراو دەکات (حكم تكفير المعين) وە هەروەها باسی جیاوازی نێوان بەرپابوونی بەڵگە و تێگەیشتن لە بەڵگە دەکات (الفرق بين قيام الحجة وفهم الحجة)، کە تیایدا وەڵامی کۆمەڵێک گومان دەداتەوە دەربارەی ئەم دوو بابەتە بە ووتەکانی خۆیی و هەروەها وتەکانی (شيخ الإسلام ابن تيمية و ابن القيم و الشيخ محمد بن عبد الوهاب و الشيخ عبد اللطيف)، ئەم

نامەیە زۆر گرنگە بۆ موەحیدێک کە تا ئێستا کێشەی هەیە لەم باسانە، وە بۆ موەحیدێک کە نازانێت چۆن وەڵامی گومانەکانی مورجیئە و جەهمیەکان بداتەوە.

بە پێویستی دەزانم چەند تێبینیەک باس بکەم دەربارەی چۆنیەتی وەرگێڕانم بۆ ئەم نامەیە، وە هەروەها دەربارەی خودی نامەکەش :

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی لێرەدا من وەرگێڕم نەوەک نوسەر بۆیە ناچاربوومە کە هەمان ئەم ووشانە وەربگێڕم کە شێخ (ئیسحاق) بەکاری هێناوە بەبێ دەستکاری کردن، واتا بەشێوەی (تەرجەمەی حەرفی) وەرم گێڕاوە واتا ئەوەی شێخ (ئیسحاق) نوسیویەتی وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی واتا بەبێ (تصرف) کردن لە نەقل کردندا بۆ پاراستنی ئەمانەتی عیلمی، بەڵام ئەم کارە خوێنەر توشی کێشە دەکات لە هەندێک شوێندا چونکە تەرجەمەی حەرفی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ئەستەمە هەمان مانای تەواوی خۆیدا بدات لە هەموو ڕستەیەکدا، بۆیە ناچاربووم لەو شوێنانەی کە پێویستی بە شەرحە، تەرجەمەی حەرفی ماناکەی بە تەواوی نادات لەناو دوو کەوانەی سوور ( ) بەم شێوەیە شەرحم کردووە، وە لە هەر شوێنێک شێخ (ئیسحاق) باسی شتێکی کردبێت کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە بێت ئەوا بە هەمان شێوە لەناو دوو کەوانەی سووردا نوسیومە، واتا ئەوەی لەم نامەیەدا بە ڕەنگی سوور نوسراوە ووتەی وەرگێڕە نەوەک شێخ (ئیسحاق)، وە ئەوەی بە ڕەنگی ڕەش نوسراوە خودی نامەکەی شێخەو تەنها وەرم گێڕاوە بۆ زمانی کوردی.

**دووەم:** شەرح و ڕوونکردنەوەی هەندێک شت پێویستە لە پەراوێز (هامش – حاشیة) بنوسرێت، بەڵام من وام نەکردووە، هەر لەناو ووتەکانی شێخدا ئەوەی پێویست بووە لەناو دوو کەوانەی سووردا نوسیومە، ئەمەش لەبەر ئەوەی تاوەکو خوێنەر ئاسانتر و خێراتر تێبگات بەبێ گەڕانەوە بۆ پەراوێز کە لە بەشی خوارەوەی پەڕدا دەنوسرێ.

**سێیەم:** لە زۆر شوێنی ئەم نامەیەدا شێخ (ئیسحاق) نامەکانی شێخ (محمد بن عبد الوهاب)ی نەقل کردووە کە ئەم نامانە وەڵامی کۆمەڵێک نامەی تێدا دراوەتەوە کە بە پرسیار بۆ شێخ (محمد بن عبد الوهاب) نێردراون، بەڵام بەهۆی لەبەر دەست نەبوونی ئەو نامانەی کە وەکو پرسیار بۆ شێخ (محمد بن عبد الوهاب) نێردراون، ئەوا لە هەندێک شوێندا تێگەیشتن لە وەڵامەکانی شێخ (محمد بن عبد الوهاب) زەحمەتە چونکە وەڵامەکەی ئەو بەگوێرەی پرسیارەکانە ئێمەش نامەی پرسیارەکانمان لا نیە، جا پێویستە بە ووردی بخوێندرێتەوە.

**چوارەم:** ئەم نامەیەی شێخ (ئیسحاق) دەستنووسی ئەصلی (مخطوطة) کە بە دەستی شێخ (ئیسحاق) نوسراوە بوونی نەماوە، بەڵکو تەنها یەک نوسخەی دەستنوسی لەبەر دەستدایە ئەویش نوسخەی (عبد العزیز بن فوزان)ە، کە حەوت ساڵ بەر لە وەفاتکردنی شێخ (ئیسحاق) نوسیویەتی واتا ساڵی (1312)ی کۆچی وەکو

خۆی دەڵێت ئەم نوسخەیەم لەسەر نوسخە ئەصلیەکەی دەستی شێخ (ئیسحاق) نوسیوە، واتا ئەم نوسخەیەی (عبد العزیز الفوزان) کۆپی نوسخە ئەصلیەکەی دەستی شێخە کە بوونی نەماوە.

**پێنجەم:** ئەم (عبد العزیز الفوزان)ە لەگەڵ شێخ (ئیسحاق) ژیاوە، ئەو (عبد العزیز فوزان)ە نیە کە ئێستا لە سعودیە دەژیت کە زانایەکی گومڕایە.

لە کۆتاییدا دەڵێم : ئەوەی پێکاومە لە خواوەیە ، ئەوەشی هەڵەم کردووە لە شەیطانەوەیە، هیوادارم ئەم کارەم بە ئیخلاصەوە بۆ الله کردبێت، وە لێمی قبوڵ بکات و سوود بە برا و خوشکانی موسڵمانیش بگات و دوعای خێرم بۆ بکەن.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

**براتان (باوکی بێگەرد پێنجوێنی)**

# بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين، ولا عدوان إلا على الظالمين والعاقبة للمتقين، وأشهد أن لا إله إلا الله الأحد الصمد الذي لا يستغاث في الشدائد ولا يدعى إلا إياه، فمن عبد غيره فهو المشرك الكفور بنص القرآن ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله، صلى الله عليه وعلى آله وصحبه أجمعين، الذي قامت به الحجة على العالمين، فلا نبي بعده ولا رسول، أما بعد:**

پێمان گەیشت و بیستمان لە کۆمەڵێک کە بانگەشەی عیلم و دین دەکەن، وە لە کەسانێک کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە شوێنکەوتووی (الشيخ محمد بن عبد الوهاب)ن، کەوا ئەگەر کەسێک شیرك بۆ خوا بڕیار بدات و بت بپەرستێ، ئەوا خودی کەسەکە کوفر و شیرکی بەسەردا نادرێ، وە هەندێک کەس لەوانە کە بە دەمی خۆی ئەم شتانەی بۆ باس کردووم، گوێ بیستی هەندێک لە برایان بووە (برایان واتا موەحیدان) کە شیرك و کوفریان بەسەر پیاوێک داوە کە هاواری پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم"ی کردووە و داوای بە هاناوە چوونی لێکردووە، پیاوەکەش پێی وتووە: (کوفر و شیرك)ی بەسەردا مەدە تاوەکو شارەزای دەکەی لەم بابەتە (واتا إقامة الحجة)، جا ئەم کەسە و هاوشێوەکانی گوێ نادەن بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ موشریکەکان چ لە سەفەردا چ لەناو شار و ماڵیاندا، بەڵکو جگە لەوەش داوای فێربوونی عیلم دەکەن لەلایەن کافرترین کەس لە زانایانی موشریکان، جا ئەم زانایانە کۆمەڵێک گومانیان بۆ دروست دەکەن و دەیڕازێننەوە دەربارەی ئەو شتانەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن، وە باسی هەندێک لەو گومانانە دەکەین لەچوارچێوەی ئەم نامەیەدا إن شاء الله تعالى، وە هەندێک کەسی هیچ و پوچ لە شوێنکەوتوانیان هەڵخەڵاتاون بەم گومانانە، وە کەسێک کە نە زانستی هەیە و نە حاڵی ئەم کەسانە دەزانێت و نە جیاوازی دەکات و نە تێگەیشتنی هەیە، ئەمانە بە لاشەیان جیادەبنەوە لە برایان وە بە دڵیان لە شێخەکان (واتا حەز ناکەن لەگەڵ برا موەحیدەکان هەڵسان و دانیشتن بکەن و لەگەڵیان بن، ڕقیان لێیانە بەهۆی ئەو گومانانەی کە بۆیان دروستکراوە وادەزانن ئەوان خەواریج و تەکفیرین، بەهەمان شێوە لە دڵەوە حەزناکەن لە مەجلیسی شێخە موەحیدەکان دانیشن وپێیان ناخۆشە) وە نەرم و نیانن لەگەڵ موشریکان، جا ئەمانە دڵتەنگ دەبن بە برایان و برایان پێیان دڵتەنگ دەبن، بەهۆی ئەو گومانانەی کە دەری دەخەن وە بەهۆی ئەم خەم و دڵتەنگیەی کە پێوەیانەوەدیارەوە بەهۆیتێکەڵاویان لەگەڵ فاسقان و موشریکان.

وە ئەمانە خەڵکی کافر ناکەن تەنها بە شێوەی گشتی (واتا دەڵێن فلانە شت کوفرە بەڵام ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات کافر نابێت "تكفير المطلق یان تكفير النوعي"ی پێ دەوترێ)، وە لەنێوان خۆیاندا زۆر خۆیان بە

دوور دەگرن لە تەکفیرکردن، پاشان بیدعە و گومانەکانیان بڵا بوویەوە تاوەکو ڕەواج بەم بیدعە و گومانانە درا لەلایەنی کەسانی زۆر تایبەت لە برایان، ئەمەش هۆکارەکەی والله أعلم بەهۆی وازهێنان لە کتێبەکانی أصول الدین وگرنگی پێنەدانی، وە نەترسان لە لادانی دڵ لە حەقەوە بۆ باطل (واتا زیغ، بەهۆی گوێگرتنیان لە ئەهلی شوبوهات)، پشتیان کردووە لە نامەکانی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) قدس الله روحه، وە نامەی کوڕەکانی، کە ئەم نامانە کەفالەتی ڕوونکردنەوەی ئەم گومانانە دەکەن کە دێینە سەری، وە هەر کەسێک کەمترین زانستی هەبێت سەیری حاڵی خەڵکی بکات لەمڕۆدا وە سەیری بیروباوەڕی ئەم شێخانە بکات کە باسمان کردن (شێخە موشریکەکان، چونکە کافریان لەلا موسڵمانە) ئەوا زۆر سەرگەردان دەبێت، ولا حول ولا قوة إلا بالله.

وە هەندێک لەو کەسانەی کە باسمان کردن لێرەدا باسی یەکێکیان دەکەین کە دەڵێ: "ئێمە بەو خەڵکە دەڵێین کە سەردانی ئەو گومەزانە دەکەن و گومەزەکە دەپرستن و وە ئەو کەسەش کە لەناوی دایە دەیپەرستن، ئەم کارەتان شیرکە بەڵام موشریك نابن".

سەیرکە و سوپاسی پەروەردگارت بکە و داوای سەلامەتی لێبکە، ئەم وەڵامە یەکێکە لە وەڵامەکانی (داود بن جرجیس العراقي) کە (الشیخ عبد اللطیف) (برای الشیخ إسحاق) وەڵامی داوەتەوە (لە کتێبی منهاج التأسیس والتقدیس)، وە ئەو کەسەی کە ئەم شتەی پێ ووتم باسی ئەوەی کرد کە هەندێک قوتابی لێیان پرسیوە (لە داود) دەربارەی ئەم بابەتە (تکفیر المعین) وە ئایا بەڵگەی چیە دەربارەی وەڵامەکەی کە پێیان دەدات ؟ ئەویش وتی (واتا داود) : "جۆری کارەکە بە کوفر دادەنێین بەڵام ئەنجامدەرەکەی کافر ناکەین تاوەکو بۆی ڕوون دەکەینەوە (واتا إقامة الحجة)، وە بەڵگەشم دەربارەی ئەم وەڵامە ئەوەیە کە لە چەند نامەیەکی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) قدس الله روحه، بینیومانە کە ئەو ڕێگری کردووە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسە جاهیلانەی کە گومەزی (الکواز و عبد القادر) دەپەرستن چونکە هیچ کەسێک نەبووە ئاگاداریان بکاتەوە".

سەیرکە و ئەو سەمەرەیە ببینە وە داوای سەلامەتی لە خوا بکە، وە داوای سەلامەتی لێبکە (من الحور بعد الکور) (ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە "صلی الله علیه وسلم"، واتا پەنا بەخوا دەگرم لە هەڵوەشاندنەوە دوای پێچانەوە، ماناکەی فراوانە لێرەدا حصر ناکرێت)، نموونەی ئەمانە چەندە بە نموونەی ئەو چیرۆکە ناودارەی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) دەچێت، کە ڕۆژێک باسی (أصول الدین)ی دەکرد و ڕوونی دەکردەوە، وە یەکێک لەو پیاوانەی کە لە مەجلیسەکەی دانیشتبوو نە تێڕادەما و نە پرسیاری دەکرد و نە لێی دەکۆڵیەوە، تاوەکو چەند ووشەیەک هات کە هەندێک هەڵەی تێدابوو، پیاوەکە ووتی : ئەمە چیە ! چۆن شتی وا دەبێت ؟ شێخیش ووتی : "خوا بتکوژێ، ئەمڕۆ لەوەتەی باسی ئەم بابەتە دەکەین هیچ تێنگەیشتی و هیچ پرسیارت نەکرد، بەڵام کاتێک ئەم هەڵەیە هات دەست بەجێ زانیت، تۆ وەکو مێش وای تەنها لەسەر شتی پیس دەنیشیت".

وه ئێمه دەڵێین (واتا الشيخ إسحاق وادەڵێ): الحمد لله وه ستايش بۆ خوا، وه داوای یارمەتی و پێکانی لێدەکەین، وەهیچ شتێک ناڵێین جگه لەوەی شێخەکانمان ووتویانه وەکو (الشيخ محمد بن عبد الوهاب) له کتێبی (مفيد المستفيد في كفر تارك التوحيد)، وه نەوەکەی (الشيخ عبد اللطيف) له وەڵامدانەوەی بۆ (داود بن جرجيس العراقي) (له کتێبی منهاج التأسيس والتقديس) وه ئەمه قسەی پێشەوایانی تری دینن پێش ئەوان.

وه یەکێک لەو شتانەی که زانینی شتێکی زەرورەته له دیندا (معلوم من الدين بالضرورة واتا عەوام و عالیم تیایدا یەکسانن له زانیندا) ئەوەیه که گەڕانەوە (مەرجەع) له بابەتەکانی أصول الدين بۆ کتاب و سوننەت و ئیجماعی موعتەبەری ئوممەته که ئەویش ئەوەیه که هاوەڵان لەسەری بوونه، وه مەرجەع بۆ خودی زانایەک نیه لەم بابەتانەدا، جا هەر کەسێک ئەم بناغەیەی لەلا چەسپا چەسپانێک که گومان لاینەدات و تێکەڵ به ئەصلی دڵی ببێت، ئەوا لەلای ئاسان دەبێت کاتێک وتەی لێکچوو (متشابه)ی ئیمامەکان دەبینێت له هەندێک له کتێبەکانیاندا، چونکه جگه له پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ کەسێک مەعصوم نیه (پارێزراو نیه له هەڵە).

وه ئەم بابەتەشمان بریتیه له بەندایەتی کردن بۆ الله به تەنها بەبێ هاوبەشدانان بۆی، وه بەڕائەت کردن له بەندایەتیکردنی جگه له الله، وه هەرکەسێک بەندایەتی بۆ الله و غەیری الله بکات ئەوا شیرکی گەورەی بڕیارداوه که له دین دەیخاته دەرەوە، ئەمه ئەصلی ئەصلەکانه، وه بەمەش خوا پێغەمبەرانی ناردووه و کتێبەکانی دابەزاندووه، وه ئیقامەی حوججه کراوه لەسەر خەڵکی به قورئان و پێغەمبەر، ئا بەم شێوەیه وەڵام دەدۆزیتەوه لەلای پێشەواوایانی دین دەربارەی ئەم ئەصله لەکاتی تەکفیرکردنی کەسێک که شیرکی بۆ خوا بڕیارداوه: "داوای تەوبەی لێدەکرێت ئەگەر تەوبەی نەکرد دەکوژرێت". باسی شارەزاکردن (إقامة الحجة) ناکەن له بابەتەکانی أصول (واتا تەوحید و شیرك)، بەڵکو باسی شارەزاکردن دەکەن (إقامة الحجة) له بابەته شاراوەکان ئەو بابەتانەی که بەڵگەکانی شاراوەیه لەلای هەندێک له موسڵمانان، وەکو ئەو بابەتانەی که ئەهلی بیدعه مشتومڕی لەسەر دەکەن وەکو قەدەرییەکان و مورجیئەکان، یان له بابەتی شاراوه وەکو سیحری صەرف و عەطف (دوو جۆری سیحره یەکەمیان بۆ تێکدانی نێوان ژن و مێردە، دووەمیان بۆ دڵ ڕاکێشانی ژن و مێرده بۆ یەکتر).

جا چۆن گۆڕپەرستان ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکرێت لەکاتێکدا ئەوان موسڵمان نین و ناچنه ناو بازنەی ئیسلامەوە، جا ئایا لەگەڵ شیرك هیچ کردەوەیەک دەمێنێتەوە لەکاتێکدا الله تعالى دەفەرمووێ: {وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ} {الأعراف : 40}، {وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ} {الحج : 31}، {إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ} {النساء : 48 و 116}، {وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ} {المائدة : 5}، وه چەندان

ئایەتی تریش جگە لەمانە، بەڵام ئەو بیروباوەڕەی کە ئەوانە هەیانە پابەندیان دەکات بە بیروباوەڕێکی تری ناشرینەوە کە ئەویش ئەوەیە کە حوججە بەرپانەبووە لەسەر ئەم ئوممەتە بە قوڕئان و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پەنا بەخوا لە خراپ تێگەیشتنێک کە ئەوانی توشی لەبیرچوونی قوڕئان و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووە، بەڵکو ئەهلی فەترە (أهل الفترة) ئەوانەی کە پەیامی خوا و قوڕئانیان پێنەگەیشتووە، وە مردوونە لەسەر جاهیلیەت پێیان ناووترێ موسڵمان بە ئیجماع وە داوای لێخۆشبوونیشیان بۆ ناکرێ، بەڵکو ئەوەی هەیە ئەوەیە کە زانایان خیلافیان هەیە لەسەر سزادانیان لە قیامەت، وە ئەو گومانەی کە باسمان کرد هاوشێوەی ئەو یان بچوکتر لەو توشی خەڵکانێک بووە لە سەردەمی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله، بەڵام ئەوەی توشی ئەم گومانە دەبێت بە گومان دەیبینێت و داوای ڕوونکردنەوەی دەکات، بەڵام ئەوانەی کە باسمان کردن ئەم گومانە دەکەن بە ئەصل (ئەصلی دین)، وە حوکم لەسەر تەواوی موشریکان دەدەن بەوەی کە دەبێت ئیقامەی حوججەیان لەسەر بکرێت سەرەتا، وە هەر کەسێک موخالەفەیان بکات بە جاهیلی دادەنێن، جا (بەم حاڵەوە) سەرکەتوو نابن بۆ پێکانی حەق، چونکە لەم کارەیاندا ئارەزوو (هەوا) هەیە ئەویش بریتیە لە تێکەڵاوبوون لەگەڵ موشریکان، ربنا لا تزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا، الله أكبر لادەران لەسەر ڕێگای ڕاست چەندە زۆرن و هەستیشی پێ ناکەن، جا ئێمە باسی ئەم پێشەکیەمان کرد بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێک بۆ تێگەیشتنی ئەو بەڵگانەی کە باسیان دەکەین دەربارەی ئەم بابەتە.

## نامەیەکی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) دەربارەی ئەم بابەتە:

(الشیخ محمد بن عبد الوهاب) ئەم نامەیەی بۆ (أحمد بن عبد الكريم) دانیشتووی شاری (الأحساء) نوسیوە، کە یەکێک بووە لە پیاوچاکان لەسەرەتادا پێش ئەوەی توشی فیتنە ببێت (شارەزای تەوحید بووە و تەکفیری موشریکانی کردووە، پاشان بەهۆی تێگەیشتنی بە هەڵە لە هەندێک وتەی ابن تيمية رحمه الله، توشی گومان هات) ئێمەش بەشێکی نامەکە باس دەکەین چونکە هاوشێوەیە لەگەڵ خاوەنی ئەو نامەیەی کە وەڵاممان دایەوە (ئەوەی کە ووتی موسڵمانێک داوای بە هاناوەچوون لە پێغەمبەر بکات کافر نابێت تاوەکو ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت)، ئەمەش دەقەکەیەتی:

"لە (محمد بن عبد الوهاب)ەوە بۆ (أحمد بن عبد الكريم)، سلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين، أما بعد: نامەکەت گەیشت کە باسی ئەوە دەکەیت هەندێک کێشەت (گومانت) هەیە داوای لابردنی دەکەیت، پاشان نامەیەک لەلای تۆوە هاتووە کە باسی ئەوە دەکەیت وتەیەکی شيخ الإسلام (ابن تيمية)ت بینیوە و گومانەکەتی لابردووە، داوا لە خوا دەکەین هیدایەتت بدات بۆ دینی ئیسلام، جا وتەکەی (شيخ الإسلام) بەڵگەیە لەسەر چ شتێك ؟ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یەکێک بت بپەرستێ پەرستنێک زیاتر لە پەرستنی لات

و عوززا وه جنێو بدات به دینی پێغەمبەر دوای ئەوەی باوەڕی پێ هێنا (مەرج نیە جنێو بە خودی دینی ئیسلام بدات، بەڵکو جنێو بە دەست بڕین و ڕەجم و سەربڕین و جەلدە لێدان و حوکمەکانی السبي و تەکفیرکردن و جیهاد و موجاهیدان و موەحیدان دەدات بەهۆی جێبەجێ کردنیان بۆ حوکمەکانی ئیسلام)، ئەوا خودی کەسەکە تەکفیر ناکرێت ؟ بەڵکو وتەکەی (شیخ الإسلام) ڕاشکاو و ڕوونە دەربارەی تەکفیرکردنی هاوشێوەکانی (ابن فیروز و صالح بن عبد الله) کە ئەوان باشتریشن لەم دووانە (واتا ئەو کەسانەی کە ابن تیمیة تەکفیریان دەکات حاڵیان باشتریشە لە ابن فیروز و صالح بن عبد الله)، (کوفری ئەمانە) کوفرێکی ئاشکرایە کە لە دین دەریان دەکات، جا ئەمە ڕوونە لە وتەی (ابن القیم)، وە وتەی (شیخ الإسلام) کە باست کرد گومانەکانی بۆ لابردی لەسەر کوفری ئەو کەسەی کە ئەو بتە دەپەرستێ کە لەسەر گۆڕی (یوسف) و هاوشێوەکانیەتی، وە لێیان بپاڕێتەوە لەکاتی ناخۆشی و خۆشیدا، وە جنێو بە دینی پێغەمبەر بدات، پاش ئەوەی دانی پێ بنێت و شایەتی بدات، وە بچێتە سەر دینی بت پەرستی پاش ئەوەی دانی پێ بنێت، وە لەم وتەیەمدا هیچ سەرکێشی (مجازفة)ی تێدانیە، بەڵکو تۆ خۆت شایەتی دەدەی بەم شتانە لەسەریان، بەڵام کاتێک خوا دڵێکی کوێر کرد هیچ چارەیەک نیە لەگەڵی، وە من لێت دەترسم دەربارەی ئەم ئایەتەی کە الله تعالی دەفەرمووێ: {ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ} {المنافقون : 3}، وە ئەو گومانەی کە توشی تۆ بووە بەهۆی ئەو ماڵ و سامان و بازرگانییەوە کە بە دەستەوەیە دەترسی خۆت و منداڵەکانت لەناو بچن ئەگەر ووڵاتی موشریکان جێ بهێڵیت، وە گومانت هەیە لە رزقی خوا، وە هەروەها هاوەڵانی خراپ گومڕایان کردووی هەروەک چۆن پیشەیانە، وە تۆ پەنا بەخوا پلە بە پلە دادەبەزی، یەکەم جار لە گومان دروست بوون، پاشان مانەوە لە ووڵاتی شیرك و موالات بۆیان و نوێژکردن لە پشتیان، وە بەڕائەت کردنت لە موسڵمانان بۆ ڕازیکردنیان، پاشان کەوتیتە سەر گیانی (ابن غنام) (قوتابی شێخ محمد بن عبد الوهاب) و کەسانی تریش جگە لەو، وە بەڕائەتت کرد لە دینی ئیبراهیم و ئەوانت کرد بە شایەت بەسەر خۆتەوە بە شوێنکەوتنی موشریکان بەبێ زۆرلێکردن (الإكراه) بەڵام لەبەر ترس و ڕازیکردنیان (بۆ خۆپاراستن لە خراپەیان)، وە ئەم ئایەتەت بیرچوو دەربارەی عمار بن یاسر (رضي الله عنه) وە هاوشێوەکانی: {مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ - ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ} {النحل : 106 - 107}، عوزری بە کەس نەداوە خوا جگە لە زۆرلێکراو کە دڵی جێگیر بێت بە ئیمان، بە مەرجی جێگیربوونی دڵی لەسەر ئیمان، وە زۆرلێکردن لەسەر بیروباوەڕ نابێت بەڵکو لەسەر قسە و کردار دەبێت، بە ئاشکرا فەرموویەتی کە کەسێک قسەیەکی کوفر بکات یان کارێکی کوفر بکات کافر دەبێت، تەنها زۆر لێکراو نەبێت ئەویش بەو مەرجەی کە باسکرا، کوفرکردنی ئەم کەسەش عوزری پێدراوە لەبەر ئەوەی ئەم کەسە مانەوەی لە دونیادا هەڵبژاردووە نەوەك ئەگەر ئەم کەسە عەقیدەکەشی

بگۆڕێت هەر عوزری هەبێت لە کوفرکردندا، جا بیربکەوە لە دڵی خۆتدا ئایا شمشێریان لەسەر ڕاگرتی و زۆریان لێکردی وەکو (عمار) یان نا ؟ وە بیربکەوە (عمار) کە کوفری کرد عەقیدەکەی گۆڕابوو یان لەبەر هەڵبژاردنی دونیا بوو (لە ترسی کوشتنی) ؟ جا تۆ هیچ پلەیەک نەماوە پێی نەگەیت تەنها ئەم پلەیە نەبێت کە وەکو (ابن رفیع) بە ئاشکرا و ڕاشکاوی جنێو بە دینی پێغەمبەران بدەیت، وە بگەڕێیتەوە بۆ پەرستنی (العیدروس و أبو حدیدة) و هاوشێوەکانیان، بەڵام ئەم کارە لە دەستی وەرگێڕی دڵەکانە (مقلب القلوب)، جا یەکەم شت کە ئامۆژگاریتی پێ دەکەم ئەوەیە کە بیربکەیتەوە ئەو شیرکەی کە لەلای ئێوەدا هەیە هەمان ئەو شیرکەیە کە پێغەمبەرەکەت "صلی الله علیه وسلم" نەهی لێدەکرد لە خەڵکی مەککە ؟ یان شیرکی خەڵکی مەککە جۆرێکی تربوو توندتر لە شیرکی لای ئێوە ؟ یان شیرکەکەی لای ئێوە توندترە ؟ جا کاتێک لە بابەتەکەت تێگەیشتی و زانیت کە زۆربەی ئەو کەسانەی لای ئێوە ئایەتی قورئانی بیستووە و وتەکانی زانایانی پێشوو و دوای ئەوانیشی بیستووە، وە دانی پێنا و ووتی: شایەتی دەدەم ئەمە حەقە، وە پێش (محمد بن عبد الوهاب) ئەم شتە دەزانین، ئینجا پاشان دوای ئەمە بە ڕاشکاوی جنێو بەو شتە بدات کە شایەتی دابوو کە حەقە، وە بە ڕاشکاوی شیرك و ئەهلی شیرك بە باش دابنێت، ئینجا بیربکەوە ئایا ئەمە بابەتێکی ئاساییە یان بابەتی ڕیددەیەکی ڕوون و ئاشکرایە کە زانایان باسیان کردووە لە بابەتی ڕیددە، بەڵام سەیر لەو شتانە دایە کە تۆ دەیانکەیتە بەڵگە و باست کردن، وەکو ئەوەی بڵێی ئەم قسانە لە کەسێکەوە هاتووە کە نە دەبیستێ و نە دەبینێ". (کۆتایی نامەکە بە کورتکراوەیی)

(الشیخ إسحاق بەشێکی کورتی لە نامەکە نەقل کردووە، منیش بەشێکی زیاترم نەقل کرد تاوەکو زیاتر سوودی لێ ببینین، ئەگەرچی نامەکە لەمەش زیاترە کە نوسراوە).

(الشیخ إسحاق دەڵێ) : جا لە وتەکەی وورد ببەوە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەم زانایانە، وە تەکفیرکردنی ئەوکەسانەی کە ئەو بتە دەپەرستن کە لەسەر گۆڕی یوسفە، وە ئەمەش ڕوون و ئاشکرایە لە ووتەی (ابن القیم) رحمه الله، وە هەروەها لە باسکردنی چیرۆکی خاوەنی نامەکە، وە حوکمی بەسەردا بە ئایەتەکەی سورەتی (المنافقون) وە ئەمەش حوکمێکی گشتیە (واتا هەرکەسێک وابێت ئەم حوکمەی لەسەر دەچەسپێ)، وە بەهەمان شێوە لە حاڵی زۆربەی ئەم کەسانەی ئەمڕۆ وورد ببەوە کە خۆیان داوەتە پاڵ عیلم و دین لە خەڵکی (نەجد) دەچێتە شار و وڵاتی موشریکان و لەلایەن دەمێنێتەوە ماوەیەک داوای فێربوونی عیلم دەکات لێیان و لەگەڵ دادەنیشێت، پاشان کە دەگەڕێتەوە بۆلای موسڵمانان کە پێی دەوترێ لە خوا بترسە و تەوبە بکە بۆلای پەروەردگار لەم کارەت، گاڵتە دەکات بەو کەسەی کەوای پێ دەڵێ، دەڵێ تەوبە بکەم لە داواکردنی فێربوونی عیلم ؟ پاشان لە کردەوە و قسەکانی خراپی عەقیدەکەی دەردەکەوێت، ئەمەش هیچ سەیر نیە چونکە ئەم کەسە سەرپێچی فرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە بە تێکەڵبوونی لەگەڵ موشریکان جا خوا سزای داوە، بەڵام سەیر لە ئەهلی تەوحید و دین دایە لە کراوەییەکان لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە، کە ئەم

جۆره کەسانە ویستیان یەکسانی و نزیک بوونەوە بکەن لەنێوان موشریکان و موەحیدان، لەکاتێکدا خوا جیاوازی خستۆتە نێوانیان لە کتێبەکەیدا و هەروەها لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی محمد "صلى الله عليه وسلم".

پاشان (الشيخ محمد بن عبد الوهاب) دوای ئەوەی لە نامەکەیدا باسی ئەوەی کرد کە کەسانێکی زۆر لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە دوای پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" وەکو ئەوانەی سەردەمی أبو بکر (رضي الله عنه) کە حوکمی ریددەی بەسەرداداان بەهۆی نەدانی زەکات، وە هەروەها وەکو هاوەڵانی علي (رضي الله عنه) (مەبەستی عبد الله بن سبأ اليهودي و شوێنکەوتووانیەتی کە ووتیان ئیمامی علي خوایە)، وە هەروەها ئەو خەڵکانەی کە لە مزگەوتی (الكوفة) بوون (ابن مسعود و هەموو هاوەڵان رضي الله عنهم تەکفیری هەموویانیان کرد بەهۆی دان پێدانانیان بە پێغەمبەرایەتی درۆینەی المسيلمة وە هاوەڵان خیلافیان هەبوو لە قبوڵکردنی تەوبەیان، بەڵام ئەوەی کە دەوترێ کەسێک ووتی: المسيلمة پێغەمبەرە و ئەوانی تریش بێدەنگ بوون و هەموویان تەکفیرکران بەهۆی بێدەنگ بوونیان ئەثەرێکی زەعیفە ئەگەرچی ماناکەی ڕاستە)، هەروەها (بني عبيد القداح) (دەوڵەتی عوبەیدییەکان کە رافیزەی باطنی بوون) هەموو ئەمانە حوکمی ریددە درا بەسەر خودی کەسەکان (تكفير المعين)، پاشان ووتی (واتا الشيخ محمد بن عبد الوهاب) : ئەو وتەیەی (شيخ الإسلام) کە تۆیان پێوە توشی گومان کردووە لە هەمووی توندترە، ئەگەر ئێمەش وابڵێین ئەوا دەبێت زۆربەی کەسە ناودارەکان تەکفیر بکەین، (شيخ الإسلام) بە ڕوونی تیایدا باس دەکات "خودی کەسەکە (ئەوەی کوفر دەکات = المعين) کافر ناکرێت تاوەکو ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت". جا ئەگەر خودی کەسەکە ئیقامەی حوججەی لەسەرکرا ئینجا کافر بکرێت، ئەوا شتێکی مەعلومە کە بەرپاکردنی حوججە مانای ئەوە نیە کە لە وتەی خوا و پێغەمبەرەکەی تێبگات هەروەک تێگەیشتنی أبو بکر (رضي الله عنه)، بەڵکو کە وتەی خوا و پێغەمبەرەکەی پێگەیشت و هیچ شتێکی نەما کە ببێتە عوزر بۆی (مەبەستی عوزری شەرعیە نەوەک عوزری مورجیئەکان کە دواتر باسی دەکەین إن شاء الله تعالى) ئەوا کافرە (واتا کافرە لە دونیا و قیامەتدا، بەڵام ئەو کەسەی کە ووتەی خوا و پێغەمبەرەکەی پێناگات لە دونیادا بە کافر دادەنرێت بەڵام لە قیامەتدا قەولی ڕاست ئەوەیە تاقیدەکرێتەوە)، هەروەک چۆن کافران هەموویان ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکرێت بە قورئان لەکاتێکدا الله تعالى دەفەرمووێ: {إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ} {الكهف : 57}، (واتا پەردەمان بەسەر دڵیان داداوە تاوەکو لە قورئان تێنەگەن، کەچی قورئان هەر حوججەشە لەسەریان چونکە تێگەیشتن مەرج نیە بەڵکو پێگەیشتن مەرجە، جا ئەگەر تێگەیشت ئەوکات هیدایەت وەردەگرێت و موسڵمان دەبێت ئەوکات باسی تەکفیر نامێنێت مەگەر کەسێک ئینکار بێت دوای تێگەیشتنیش ، چەندە سەیرە عوزری مورجیئەکان)، وە هەروەها الله تعالى دەفەرمووێ: {إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ} {الأنفال : 22}، (واتا خراپترین بوونەوەر

لەلای خوا کەسێکی کەڕی لاڵە ئەو کەسانەی کە تێناگەن و هۆش وەرناگرن)، ئەمەش لەکاتێکدا قسەی (شیخ الإسلام) دەربارەی ڕیددە و شیرك نیە بەڵکو دەربارەی بابەتی لاوەکین.

پاشان ووتی (واتا الشیخ محمد بن عبد الوهاب) : "شیخ الإسلام ڕوونی دەکاتەوە کە ئەگەر مونافیقان نیفاقەکەیان دەربخەن ئەوا دەبنە مورتەد، جا کوا ئەوەی کە تۆ دەڵێی شیخ الإسلام کەس کافر ناکات بە دیاریکراوی (تکفیر المعین؟)".

وە هەروەها (شیخ الإسلام) دەربارەی المتکلمین وهاوشێوەکانیان و ئیمامەکانیان و جۆری ڕیددەکانیان قسە دەکات و دەڵێ: "ئەگەر لە بابەتە شاراوەکان (المسائل الخفیة) کەسێک تێوەگلێ دەوترێ هەڵەیە و گومڕایە و ئیقامەی حوججەی لەسەر نەکراوە، بەڵام هەندێک کۆمەڵە لە بابەتی ئاشکرا و دیار (المسائل الظاهرة) تێوەدەگلێن، کە موشریکەکان و یەهود و نەصاراش دەزانن کە محمد "صلی الله علیه وسلم" نێردراوە بەم بابەتانەوە و ئەو کەسە کافر دەکات کە پێچەوانەی بێت (واتا لای کافرانیش ڕوونە کە ئەم شتانە لە دینی ئیسلام کوفرن، کەچی زۆرێک لە موسڵمانان بە عالیم و عەوامەوە تێوەدەگلێن) نموونەش (لەسەر ئەم بابەتە ئاشکرایانە) وەکو فرمان کردن بە بەندایەتی تەنها بۆ الله و بەبێ هاوبەشدانان، وە نەهی کردن لە بەندایەتی کردن بۆ غەیری الله جا چ پێغەمبەران بێت یان فریشتەکان یان جگە لەوانیش، ئەمە دیارترین دروشمی ئیسلامە، کەچی زۆرێک لە سەرکردەکانیان کەوتوونەتە ناو ئەم جۆرە کوفرانەوە و مورتەد بوونە، وە هەندێک جار زۆرێک لەوان لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە هەڵگەڕانەوەیەکی ڕوون و ڕاشکاو، وە لەمەش زیاتر تیایاندا هەیە کە کتێب دەنوسێت لە بابەتی ڕیددە وەکو (الرازي) کە کتێبی نوسی دەربارەی پەرستنی هەسارەکان جا ئەمە هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام بە یەکدەنگی موسڵمانان".

(فخر الرازي الأشعري، ئەگەرچی تەوبەی کرد لەم کارەی و گەڕایەوە بۆ ئیسلام، هەروەها دەڵێن گەڕایەوە سەر مەزهەبی ئەهلی سوننە لە عەقیدەدا، پێش مردنی گریاوە و وتویەتی خۆزگە خۆم بە عیلمی کەلام سەرقاڵ نەکردبوایە، "ابن تیمیة و ابن القیم و ابن الصلاح و ابن کثیر و الذهبي" باسی تەوبەکردن و گەڕانەوەی دەکەن بۆ عەقیدەی ئەهلی سوننە، وە ابن تیمیة ڕەحمەتی بۆدەنێرێ، ولله عاقبة الأمور).

ئەمە ووتەی (شیخ الإسلام)ە بە پیتەوە، جا وورد ببەوە لە ووتەکانی دەربارەی جیاوازی کردنی لە نێوان بابەتە شاراوەکان و دەربارەی ئەو بابەتەی کە ئێمە باسی دەکەین سەبارەت بە تەکفیری کەسی دیاریکراو (تکفیر المعین)، وە وورد ببەوە لە تەکفیرکردنی (شیخ الإسلام) بۆ سەرکردەکانیان فلان و فلان بە دیاریکراوی وە ڕیددەکەیان ڕیددەیەکی ڕوون و ڕاشکاوە، وە وورد ببەوە لە بەئاشکرا باسکردنی (شیخ الإسلام) دەربارەی ئیجماع لەسەر هەڵگەڕانەوەی (الرازي) لە ئیسلام لەکاتێکدا یەکێکە لە گەورەترین زانایانی شافعی، جا ئایا ئەم وتانەی دەگونجێ لەگەڵ ئەوەی بووترێ (شیخ الإسلام) کەسی دیاریکراو تەکفیر ناکات ئەگەرچی لە (عبد

القادر) بپارێتەوە لە خۆشی و ناخۆشیدا، وە ئەگەرچی (عبد الله بن عوف)ی خۆشبوێ و وایدابنێت دینەکەی ئەو چاکە، لەگەڵ ئەوەش (أبو حديدة) بپەرستێ ؟

وە هەروەها (شيخ الإسلام) دەڵێ: "بەڵكو هەموو شیرکێک لە جیهاندا بەهۆی ڕەئی هاوشێوەکانیان ڕوویداوە (مەبەستی المتكلمين و هاوشێوەکانیانە، "المتكلمين يان أهل الكلام" ئەوانەن کە بۆ سەلماندی بابەتە عەقیدەییەکان پەنا دەبەنە بەر عەقڵ نەوەک دەقی شەرعی، وەکو ئەشعەری و ماتوریدی و موعتەزیلی و قەدەری و جەبری و مورجیئە و...هتد)، ئەوانە فرمان بە شیرك دەکەن و ئەنجامی دەدەن، جا ئەوەی لەناو ئەوانە دایە کە نە فرمان بە شیرك دەکات و نە نەهیشی لێدەکات، بەڵکو هەردوولا دەگرێت (لای موەحیدان و موشریکان)، وە ئەگەر بێتو موەحیدان تەرجیحی بابەتێک بکەن (ئەگەر بە دڵی بێت لەگەڵ ئەوانە) وە یەکێکی تریان ئەگەر موشریکان تەرجیحی بابەتێک بکەن (ئەگەر بە دڵی بێت لەگەڵ ئەوانە)، (یان بۆی هەیە) ئەم کەسە پشت لە هەردووکیان بکات (واتا لای کەسیان نەگرێت)".

جا وورد ببەوە لەم شتە ئەمە شتێکی زۆر بە سوودە (بۆ حاڵی بوون)، بەهەمان شێوە ئەوانەی کە لەناو دینی ئیسلامدان (خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام)، نەهی لە شیرك ناکەن وە تەوحید بە واجب دەزانن، بەڵام شیرك بە جائیز دەزانن، بەڵکو فرمان بە شیرك دەکەن، جا کاتێک ئەمانە بانگەشەی تەوحیدیان کرد ئەوا تەوحیدەکەیان تەنها قسەیە کردار نیە.

جا لە ووتەکەی وورد ببەوە و بەراووردی بکە لەگەڵ ئەو شتەی کە شەیطان تۆی پێ هەڵخەڵەتاندووە، کە تێگەیشتنێکی بۆگەنە وایلێکردووی خوا و پێغەمبەرەکەیی و ئیجماعی ئوممەت بە درۆ بخەیتەوە، وە لاتداوەتەوە بۆ بەندایەتیکردنی طاغوت، جا گەر لەمە تێگەیشتی (ئەوا باشە) ئەگینا ڕێنموونیت دەکەم بە زۆر پاڕانەوە و ملکەچی بۆ ئەو زاتەی کە هیدایەتی بە دەستە، ترسناکیەکە زۆر گەورەیە، چونکە مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ لە پاداشتی هەڵگەڕانەوەکەت، (شایەنی ئەوە نیە) یەکسانی بکەیت بە بازرگانیەک کە تومان یان نیو تومان قازانج بکەیت (تومان : دەکاتە دە هەزار دیناری ئەوکات، هەرچەندە بە دراوی ووڵاتی ئێرانیش دەووترێ تومان بە زمانی عەرەبی، بەڵام من بۆ ئەوەی یەکەمیان دەچم نەوەک بۆ یەک تومەن و نیو تومەنی ئێرانی، هەروەک چۆن دەڵێن یەک ئۆقیە دەکاتە ئەوەندە هەزار دینارە تومانیش بەهەمان شێوە)، وە لەلای ئێمە کەسانێک هەن بە ماڵ و منداڵەوە دێن و داواش لەکەس ناکەن، وە خوای تعالى دەربارەی ئەم بابەتە فەرموویەتی: {يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ} **{العنكبوت : 56}**، {وَكَأَيِّنْ مِنْ دَابَّةٍ لَا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ} **{العنكبوت : 60}**، وتەی (الشيخ محمد بن عبد الوهاب) بەکۆتا هات بە پیتەوە لەگەڵ کورت کردنەوەی (وتەکانی)، بگەڕێوە سەری لە کتێبی التاريخ (مەبەستی کتێبی تاريخ ابن غنام)ە چونکە بەڕاستی زۆر بە سوودە.

وە مەبەست ئەوەیە کە حوججە بەرپابووە بە قورئان و پێغەمبەر، جا هەرکەسێک گوێ بیستی پێغەمبەر بوبێت (واتا بزانێت بوونی هەیە یان بوونی هەبووە) وە قورئانی پێگەیشتبێت ئەوا ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە، وە ئەمەش ڕوونە لە وتەکانی شیخ الإسلام (مەبەستی محمد بن عبد الوهاب)ە کاتێک کە دەڵێ: "مەعلومە کە ئیقامەی حوججە مانای ئەوەیە نیە لە ووتەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی تێبگات وەکو تێگەیشتنی أبو بکر (رضي الله عنه)، بەڵکو ئەگەر ووتەی خوا و پێغەمبەرەکەی پێگەیشت وە هیچ شتێکی نەما ببێتە عوزر بۆی ئەوا ئەم کەسە کافرە، هەروەک چۆن کافران هەموویان ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکرێت بە قورئان لەکاتێکدا الله تعالی دەفەرمووێ: {إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا} {الکهف : 57}". (الشیخ إسحاق هەمان وتەی پێشووی "الشیخ محمد بن عبد الوهاب"ی دووبارە کردۆتەوە لێرەدا هەروەک بینیتان).

جا وورد ببەوە لە وتەکانی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) بە هۆشیارییەوە، وە داوای هیدایەت لە خوا بکە.

ئەمە سێ شوێنە کە تیایدا (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) باسی ئەوە دەکات هەرکەسێک قورئانی پێبگات و بیبیستێ ئەوا ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە ئەگەرچی تێشی نەگات، جا ئەم شتەش سوپاس بۆ خوا هەر موسڵمانێک کە قورئانی بیستبێت باوەڕی پێی هەیە (مەبەستی بابەتی چۆنیەتی ئیقامەی حوججەیە کە تەنها پێگەیشتن مەرجە نەوەک تێگەیشتن، سەیرکە چۆن دەڵێت هەر موسڵمانێک کە قورئانی بیستبێت باوەڕی بەم شتە هەیە، کەچی ئێمەش دوای چەندان ساڵ لە خوێندنەوەی چەندەها کتێب، هەمانە تازە حاڵی دەبێت هەمانە هێشتا حاڵی نەبووە لە بابەتەکە، ئەی چی دەربارەی کەسانی تری جگە لە ئێمە ؟ لەکاتێکدا ئێمە خۆمان بە موحد ناو دەبەین! والله المستعان)، بەڵام شەیطانەکان زۆرینەی خەڵکیان گومڕاکرد و لایاندان لەسەر ئەو فیطرەتەی کە خوا خەڵکی لەسەر خەلق کردووە، پاشان وورد ببەوە لە ووتەکانی (شیخ الإسلام) دەربارەی حوکمدانی کوفر بەسەریان، وە ئایا وتی ئەمانە تەکفیر ناکرێن تاوەکو شارەزا دەکرێن (واتا إقامة الحجة)، یان وتی پێیان ناوترێ موشریك ؟ بەڵکو کارەکەیان کوفرە هەروەک چۆن ووتی، کە لەپێشوودا ئاماژەمان پێدا.

پاشان وورد ببەوە لە گێڕانەوەی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) بۆ وتەکانی (شیخ الإسلام) دەربارەی المتکلمین و هاوشێوەکانیان، کە دەڵێ: "ئەگەر لە بابەتە شاراوەکان (المسائل الخفیة) کەسێک تێوەگڵێ دەووترێ هەڵەیە و گومڕایە و ئیقامەی حوججەی لەسەر نەکراوە، بەڵام هەندێک کۆمەڵە لە بابەتی ئاشکرا و دیار (المسائل الظاهرة) تێوەدەگلێن، کە موشریکەکان و یەهود و نەصاراش دەزانن کە محمد "صلی الله علیه وسلم" نێردراوە بەم بابەتانەوە و ئەو کەسە کافر دەکات کە پێچەوانەی بێت (واتا لای کافرانیش ڕوونە کە ئەم شتانە لە دینی ئیسلام کوفرن، کەچی زۆرێک لە موسڵمانان بە عالیم و عەوامەوە تێوەدەگلێن) نموونەش (لەسەر ئەم بابەتە

ئاشکرایانه) وەکو فرمان کردن بە بەندایەتی تەنها بۆ الله و بەبێ هاوبەشدانان، وە نەهی کردن لە بەندایەتی کردن بۆ غەیری الله جا چ پێغەمبەران بێت یان فریشتەکان یان جگە لەوانیش، ئەمە دیارترین دروشمی ئیسلامە، کەچی زۆرێک لە سەرکردەکانیان کەوتوونەتە ناو ئەم جۆرە کوفرانەوە و مورتەد بوونە". پاشان (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) ووتی: "جا وورد ببەوە لە ووتەکانی دەربارەی جیاوازی کردنی لە نێوان بابەتە شاراوەکان و دەربارەی ئەو بابەتەی کە ئێمە باسی دەکەین سەبارەت بە تەکفیری کەسی دیاریکراو (تکفیر المعین)، وە وورد ببەوە لە تەکفیرکردنی (شیخ الإسلام) بۆ سەرکردەکانیان".

(لێرەدا دیسان الشیخ إسحاق هەمان ووتەکانی پێشووی "الشیخ محمد بن عبد الوهاب"ی دووبارە کردۆتەوە).

جا تۆش بوەستە و وورد ببەوە هەروەک چۆن (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) باسیکرد، جا ئەمەندە بەسە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم گومانانە، لەکاتێکدا کە (شیخ الإسلام) قدس الله روحە، ئەم بابەتەی بە بابەتە ئاشکراو دیارەکان داناوە (المسائل الظاهرة)، تەنانەت یەهود و نەصاراش دەزانن ئەم شتە هەیە لە دینی ئیسلامدا، بەڵام ئەم کەسەی کە بۆمان باسکرا کوێرایی داوە لە ئاستی ئەم شتانە، وە لەوانەشە بیخوێنێتەوە و باسیشی بکات بۆ خەڵکی (وەکو زانایانی آل سلول)، بەڵام (حوکمەکەی کە تەکفیرکردنە) جێبەجێی ناکات کە دێتە سەر واقیعی خەڵکی، ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە یەکێک لەوانە نەترسان لە نەفس و لادانی دڵ لە حەقەوە بۆ باطل و هەڵگەڕانەوەی، لەکاتێکدا سەلەفی صالح لەمانە ترساون، وە بۆی هەیە مرۆڤ ئارەزووی (هەوا) هەبێت و ڕێگری لێبکات لە فێربوونی حەق، وە دەرهێنانی حەق لەناو دەقەکاندا (دەقە شەرعیەکان)، هەروەک چۆن (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) باسیکردووە لە هەندێک لە نامەکانیدا، کە خاوەنی کتێبی (التاریخ) باسی دەکات کە ووتویەتی: ئێمە باسی بابەتێکی أصول الدین دەکەین ساڵێکی تەواو بۆ هەندێک قوتابی، جا تێیدەگەن و فێری دەبن، بەڵام کاتێک ڕوودەدات (واتا جێبەجێکردنی لە واقیعدا) تێی ناگات. بوەستە و لێی وورد ببەوە.

وە هاوشێوەی ئەمە باس دەکات کە هەندێک زانای الوشم (الوشم ناوچەیەکە لە سعودیە) باسی تەوحیدیان کردووە لە هەندێک نامەیاندا کە بۆ (الشیخ محمد بن عبد الوهاب)یان ناردووە، وە پرسیاری لێکردووە ئایا پێکاویەتی یان نا ؟ ئەویش (لە وەڵامدا) وتویەتی: "باسکردنت بۆ تەوحید ڕاستە و حەقە و پێکاوتە، بەڵام گرنگی لە کردار دایە دوای فێربوون، چونکە تۆ کاتێک کە هەندێک نامەی دوژمنانی دین گەیشتە شارەکەتان دەربارەی جنێودان بە دین و ئەهلی دین، تۆ لەگەڵیان بووی و دەرت نەکردن و لێیان جیانەبوویەوە".

(الشيخ إسحاق دەڵێ) : جا وورد ببەوە لەمە، گەر لێی دەربازبووی ئەوا لە شتێکی زۆر گەورە دەربازبووی، وورد ببەوە لە ووتەکانی (الشيخ محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله دەربارەی سەپاندنی بەسەر خاوەنی نامەکە کە ئەوان موونافیقن ئەگەر چی طاغوتیش نەپەرستن پاشان حوکمی ڕیددەی بەسەردا.

وە یەکێک لە گەورەترین شتەکان کە الشيخ (محمد بن عبد الوهاب) دەیگێڕێتەوە دەربارەی ئەم کەسە (خاوەنی نامەکە) ئەوەیە کە وەستاوە لە حوکمدان لەسەر کەسی دیاریکراو (تكفير المعين)، وە ئەوە شتەی کە ڕێگری لێکردووە لە کۆچکردن بەخۆیی و ماڵ و منداڵیەوە ئەو کاڵایانەیە کە بە دەستیەوەیە وە هەروەها ترسی هەژاریش. ئینجا سەیری حاڵی ئەو کەسە بکە کە باسمان کرد وە هاوشێوەکانی دەربارەی سەفەرکردنیان بۆلای موشریکان وە خوێندن و داوای فێربوونی عیلم لێیان بە حیسابی خۆیان، ئەمە خۆیان دانی پێدەنێت و باسی دەکەن، وە لەوانەوە دەزانن کە ئەمانە سەردانی موشریکان دەکەن، جا ئەمانە بە موالات و مەیل هەبوون بۆیان تۆمەتبار دەکرێن. وە یەکێک لە کارەساتەکان ئەمەیە کە ئەگەر یەکێک لەمانە (ئەمانەی دەچن بۆلای موشریکان) بێتەوە بۆ ناو موسڵمانان، ئەوا موسڵمانان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن بە ڕێز و سڵاوکردنەوە هەروەک چۆن پێشتر مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە لە پێش چوونی بۆلای موشریکان، وە ئەم جۆرە کەسانە باس و ستایشی وڵاتی موشریکان دەکەن وە بە ناشرینی و ناڕەزایی باسی موسڵمان و وڵاتی موسڵمانان دەکەن (هەروەک چۆن کە کوردێک لە ئەوروپا و ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان مێشکی ئەم خەڵکە پڕ دەکات لە باس و ستایشکردنی ئەم ووڵاتە کافرانە و هیوا دەخوازێت جارێکی تر بۆی بڕەخسێ سەفەری ئەم ووڵاتانە بکاتەوە، وە بە هیچ شێوەیەک باسی کوفر و بەڕەڵایی ئەم ووڵاتانە ناکات بەڵکو ستایشی دەکات، وە بە ناشرینی باسی کوردستان دەکات و لێی بێزارە، ئەمە لەکاتێکدایە کوردستانیش هەروەک ئەم ووڵاتانە کوفرستانە "دار الكفر" کەچی هێشتا پێی ڕازی نیە چونکە تۆسقاڵێک دروشمی ئایینی و دابونەریتی کۆنی تێدا ماوە، ئەی باشە ئەم جۆرە کەسانە دەبێت چۆن باسی "دار الإسلام" بکەن لەکاتێکدا بە کوردستانی "دار الكفر" ڕازی نین!!!)، وە حەتمەن ئەم جۆرە قسانە لە کەسێکەوە دەردەچێت کە شتێکی خراپی لە دڵیدا حەشار دابێت وە هەر لەسەر ئەم حاڵەشیان دەمێننەوە، وە کەسیش دژی ئەم شتەیان ناوەستێتەوە و پێی ناخۆش نیە، وە دەربارەی ئەوەی یەکێک بترسێت لێیان لەوەی توشی ڕیددە و زەیغ بووبن بەهۆی ئەم کارانەیانەوە، ئەوا وا گومان نابەم ئەم شتە بە خەیاڵی کەسیان دابێت، هەروەک چۆن بڵێی ئەو حوکمە شەرعییانەی کە دەدرێت بەسەر یەکێکدا کە ئەم شتانە ئەنجام بدات پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەم کارانەیان.

## حوکمی کەسێک کە ئینکاری شتێک بکات کە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" پێی هاتووە وە ئیقامەی حوججەشی لەسەر کراوە

هەروەک الشیخ (محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله، وە (شیخ الإسلام)یش پێش ئەو باسی کەسانێکیان کرد کە لەپێشوودا ئاماژەمان پێدان، جا سەیری حاڵت بکە و بیربکەوە دەربارەی عەقیدەکەت، گەر لەم شتە دەرباز بیت ئەوا لە شتێکی زۆر گەورە دەرباز بووی، ئەگینا ئەوا هیچ سەیرنیە ولا حول ولا قوة إلا بالله (مەبەستی بابەتی "تكفير المعين و إقامة الحجة"یە چونکە خەڵکانێکی زۆر لە عالیم و عەوام تێیکەتوون هەروەک چەند نموونەیەک باسکرا لە پێشوو).

وە بەڵگەش دەربارەی ئەم بابەتەمان ئەو نامەیەیە کە (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله نوسیویەتی بۆ (عیسى بن قاسم و أحمد بن سویلم) کاتێک پرسیاریان لێی کردووە دەربارەی وتەی (شیخ الإسلام تقي الدين) قدس الله روحه (واتا ابن تيمية) دەربارەی ئەوەی کەسێک ئینکاری شتێک بکات کە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" پێی هاتووە وە ئیقامەی حوججەشی لەسەر کرابێت ئەوا کافرە، جا الشیخ (محمد بن عبد الوهاب) وەڵامی ئەم دوو برایەی داوەتەوە بەم شێوەیە:

"سلام عليكم ورحمة الله وبركاته، وبعد: ئەوەی ئێوە باستان کرد دەربارەی وتەی (شیخ الإسلام) هەر کەسێک ئینکاری ئەمە و ئەمە بکات...هتد، وە ئێوە پرسیار دەکەن دەربارەی ئەم طاغوتانە و شوێنکەوتووانیان ئایا ئیقامەی حوججەیان لەسەر کراوە یان نا ؟ ئەم شتە زۆر سەیر و سەمەرەیە، چۆن پرسیار لەم جۆرە بابەتە دەکەن لەکاتێکدا چەندەها جار بۆم ڕوونکردوونەتەوە کە ئەو کەسەی ئیقامەی حوججەی لەسەر نەکراوە ئەوەیە کە تازە موسڵمان بووە یان لە شوێنێکی زۆر دوورە دەست گەورە بووە یان لە بابەتی شاراوەیە دایە (المسائل الخفية) وەکو سیحری صەرف و عەطف، جا ئەم کەسەیە تەکفیر ناکرێت تاوەکو ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت، بەڵام أصول الدين کە خوا ڕوونیکردۆتەوە لە کتێبەکەیدا ئەوا حوججەی خوا قورئانە، جا هەر کەسێک قورئانی پێگەیشتبێت ئەوا حوججەی پێگەیشتووە (واتا ئیقامەی حوججەی لەسەر کراوە)، بەڵام ئەصلی کێشەکە لەوە دایە ئێوە جیاوازی ناکەن لەنێوان بەرپاکردنی حوججە و تێگەیشتنی حوججە (قيام الحجة وفهم الحجة)، زۆربەی کافران و مونافیقان لە حوججەی خوا تێناگەن کەچی ئیقامەی حوججەشیان لەسەرکراوە، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: {أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا} {الفرقان : ٤٤}، (واتا تۆ وادەزانی زۆربەی ئەو کافرانە لە ئایەتەکانی خوا تێدەگەن و هۆشیار دەبنەوە ؟ ئەوانە هیچ نین تەنها ئاژەڵ نەبێت، بەڵکو لە ئاژەڵیش بێ عەقڵ ترن).

بەرپاکردنی حوججە و پێگەیشتنی حوججە شتێکە، وە تێگەیشتنی حوججە شتێکی ترە".

(سەیرکە چۆن "الشیخ محمد بن عبد الوهاب" جیاوازی کردووە لەنێوان بابەتی شاراوە و بابەتی ئاشکرا و بابەتی أصول الدین کە تەوحیدە، لە بابەتە شاراوەکان وەکو سیحری صەرف و عەطف و هەندێک بابەتی ئەسماء و صیفات و قەدەر ئەوەی بەڵگەکانی لانەبێت و بکەوێتە هەڵەوە تەکفیر ناکرێت نە لە دونیادا نە لە قیامەت "وەکو نموونەی ئەو پیاوەی کە ووتی بم سوتێنن بەهۆی نەزانینی لە ووردەکاری قودرەتی خوا کە ئەمەش بابەتێکی ئەسماء و صیفاتە"، وە لە بابەتە ئاشکرا و دیارەکاندا کە عەوامی خەڵکی هەموو دەیزانن بە منداڵ و گەنج و پیر و خوێندەوار و نەخوێندەوار وەکو واجب بوون و حەرام بوونی هەندێک شت، ئەمانە تەنها دوو چین عوزریان هەیە بە جەهل ئەوانیش: ئەو کەسەی لەشوێنێکی دوورە دەستە لە ئیسلام و موسڵمان وە هەر لەوێدا گەورە بووە و پێ گەییوە، وە ئەو کەسی کە تازە موسڵمان بووە هەموو حوکمەکانی ئیسلام نازانێت ئەم دوو چینە تەکفیر ناکرێن نە لە دونیادا نە لە قیامەت ئیللای دوای ئیقامەی حوججە، بەڵام لە بابەتی أصول الدین کە ڕاگرتنی تەوحید و خۆپاراستنە لە شیرك لەمەیاندا هیچ کەسێک عوزری نیە بە جەهل یان بە تەئویل کردنی هەڵە چونکە بابەتەکە ڕوونە و یەکلابۆتەوە نەزانینی جێگای عوزر نیە، وە تەئویل کردنی بەشێوەیەکی هەڵە جێگای عوزر نیە ، تەنها کەسێک نەبێت کە قورئانی پێنەگەیشتووە عوزری هەیە چونکە لەم بابەتەدا قورئان حوججەیە، واتا هەر کەسێک لەم بابەتەدا توشی کوفر و شیرك بێت، ئەوا دەست بەجێ تەکفیر دەکرێت لە دونیادا وە حیسابی کافری بۆ دەکرێت جا هەرکەسێک بێت و حاڵی هەر چۆنێک بێت، بەڵام سەبارەت بە کوشتنی یان چوونە دۆزەخیەوە لە قیامەتدا، ئەمەیان دەوەستێتە سەر ئیقامەی حوججە، گەر ئیقامەی حوججە کرابێت یان حوججە هەبێت بەڵام ئەو پشت گوێی خستبێ ئەوا داوای إستتابەی لێدەکرێت گەر نەیکرد دەکوژرێت، وە ئەگەر مورتەد بوونەکەی "ردة مغلظة" بوو واتا "ردة مجردة" نەبوو ئەوا بەبێ إستتابة کردن دەکوژرێت (واتا هەر بە مورتەد بوونەوە نەوەستا بەڵکو دژایەتی موسڵمان و ئیسلامیش بکات جا چ بە دەم بێت یان ماڵ یان بە گیانی)، وە ئەگەر زانیمان ئیقامە حوججە نەکراوە ئەوا هەر تەکفیری دەکەین لە دونیادا بەڵام ناکوژرێت و حوکمی چوونە دۆزەخی بەسەردا نادەین ئەگەر بەم حاڵەوە مرد ئیللا دوای ئیقامە کردنی حوججە لەسەری).

جا وورد ببەوە لە ووتەکانی الشیخ (واتا محمد بن عبد الوهاب) وە داوا لە خوا دەکەین تێگەیشتنێکی ڕاستت پێ ببەخشێ و بتپارێزێ لە دەمارگیری.

وە وورد ببەوە لە وتەکانی الشیخ رحمە اللە، کە هەر کەسێک قورئانی پێبگات ئەوا ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە، جا ئەگەر تێش نەگات، وە (الشیخ) ئەم جیاوازی نەکردنەی (جیاوازی نەکردن لەنێوان پێگەیشتنی حوججە و تێگەیشتنی حوججە) کردۆتە هۆکاری هەڵەی ئەو کەسانەی کە هەڵە دەکەن لەم بابەتەدا، وە (الشیخ) ئیقامەی حوججەی تەنها بۆ بابەتە شاراوەکان (المسائل الخفیة) داناوە (ئەگەرچی

"الشيخ محمد بن عبد الوهاب" وای داناوە بەڵام لە خۆیەوە داینەناوە، بەڵکو خوا و پێغەمبەرەکەی "صلی الله علیه وسلم" وا فێریان کردووین، بەڵگەش بۆ ئەمە زۆرە لە قورئان و سوننەتدا).

وە ئەو کەسەی باسمان کرد ئیقامەی حوججەی بۆ أصل الدين دانابوو !!! جا دوای قورئان و پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" هیچ ئیقامە حوججەیەک ماوە (واتا نەماوە لە أصول الدين) ؟؟؟ پاشان دەڵێ (واتا هەمان کەس) : ئەمە عەقیدەی ئێمە و شێخەکانمانە. !!! نعوذ بالله من الحور بعد الكور.

باسکردنی ئەم بابەتە گەلێک زۆرە لە کتێبەکانی الشيخ (واتا محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله، چونکە زانایە موشریکەکانی سەردەمی شێخ مشتومڕیان بوو لەسەر بابەتی تەکفیرکردنی دیاریکراو (تكفير المعين)، ئەوا شەرحی فەرموودەی عمرو بن عبسة (رضي الله عنه)، لە سەرەتاوە تا کۆتایی لەسەر تەکفیری دیاریکراوە (تكفير المعين)، تەنانەت لەناو شەرحی فەرموودەکەدا لە (شيخ الإسلام ابن تيمية)ەوە رحمه الله نەقل دەکات کە هەرکەسێک هاواری علي (رضي الله عنه) بکات کافرە، وە هەرکەسێک بە کافری نەزانێت ئەوا ئەویش کافر دەبێت.

جا وورد ببەوە چەندەها بەڵگەی شەرعی بۆ جێهێشتووی کە ئەگەر کەسێکی عاقڵ بە ئینصافەوە لێی وورد ببێتەوە چ جای ئیماندار ئەوا دەزانێت بابەتەکە بە یەکدەنگی وایە و هیچ کێشەی بۆ دروست نابێت، مەگەر کەسێک شتێک چووبێتە ناو عەقیدەیەوە.

(شەرحی ئەو فەرموودەیەی کە شێخ "ئیسحاق" باسیکرد، مەبەستی لە شەرحی شێخ "محمد بن عبد الوهاب"ە بۆ فەرموودەکە کە هەر لە سەرەتای کتێبی "مفيد المستفيد في كفر تارك التوحيد" دوای وتنی "بسم الله الرحمن الرحيم" دەست بە شەرحکردنی دەکات، فەرموودەکە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (832)، شێخ "ئیسحاق" تەنها ئاماژەی بە شەرحی فەرموودەکە داوە و شەرحەکەی نەهێناوە، من بە پێویستم زانی نەقلی بکەم بۆتان بەڵام بەبێ نەقل کردنی دەقی فەرموودەکە، بۆ خۆپاراستن لە درێژبوونەوە).
ئەمەش شەرحی فەرموودەکەیە:
(با وورد ببێتەوە ئیمانداری ئامۆژگاریکەر بۆ نەفسی خۆی کە لەم فەرموودەدا چەندەها پەند وەرگرتن هەیە، الله سبحانه وتعالى بۆمان بەسەرهاتی پێغەمبەران و شوێنکەتووانیان دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی بۆ ئیماندارانی پاش ئەوان ببێتە پەند، جا ئیماندار دەڕوانێتە حاڵی خۆیی و حاڵی ئەوان و بەراووردی دەکات، وە "الله سبحانه وتعالى" چیرۆکی کافران و مونافیقانمان بۆ دەگێڕێتەوە تاوەکو ئەوانەی تێیوەگلاون خۆیان لێی بپارێزن، جا لەو پەندانەی کە تیایدایە ئەوەیە کە ئەم ئەعرابیە جاهیلە "واتا عمرو بن عبسة" کاتێک پێیان ووت پیاوێک هەیە لە مەککە باسی دین دەکات بەشێوەیەکی پێچەوانەی خەڵکی، ئەوا "عمرو" ئارامی نەگرت تاوەکو سواری ئاژەڵەکەی بوو چووە لای پێغەمبەر، وە خۆی فێرکرد لەوەی کە لەلای پێغەمبەر هەیە، بەهۆی ئەو

خۆشەویستیەی کە لە دڵیدا هەیە بۆ دین و خێر. بەم شتە تەفسیری وتەی الله تعالى دەکرێت کە دەفەرمووێ: **"ولو علم الله فيهم خيرا لأسمعهم"** واتا گەر خوا بزانێت "کە دەشزانێت" سووربوون لەسەر فێربوونی دین و خێر لە دڵیاندا هەیە ئەوا شارەزایان دەکات و تێیان دەگەیەنێت. جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی کە تێناگەن "لە بەڵگەکان" عەدالەتی خوایە سبحانه وتعالى، چونکە دەزانێت لە دڵیان سوور بوون نیە لەسەر فێربوونی دین. جا ڕوونی کردۆتەوە کە یەکێک لە گەورەترین هۆکارەکان بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێتە خراپترین بوونەوەر، ئەوا سوور نەبوونیەتی لەسەر فێربوونی دین. جا ئەگەر ئەم جاهیلە "واتا عمرو پێش موسڵمان بوونی" داوای فێربوونی عیلم بکات، ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی شوێنکەوتنی پێغەمبەران دەکات و لە پێغەمبەرانەوە شتی پێگەیشتووە چ عوزرێکی هەیە ؟ وە زانا هەیە لەلای کە باسی عیلمی بۆ دەکات، بەڵام هیچ گرنگی پێ نادات، وە ئەگەر ئامادە و گوێ بیستی مەجلیسی عیلم بێت وەکو ئەوە وایە کە الله تعالى باسی دەکات: **"ما يأتيهم من ذكر من ربهم محدث إلا استمعوه وهم يلعبون لاهية قلوبهم"** واتا هیچ ئایەتێک و سورەتێکی نوێ لەلای پەروەردگاریانەوە دانەبەزێت ئیللا دەیبیستن و گاڵتەی پێدەکەن، دڵیان بێ ئاگایە. وە هەروەها پەندی تێدایە کاتێک کە "پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم" دەفەرمووێ: خوا منی ناردووە، ئەویش دەپرسێ: بە چ شتێک تۆی ناردووە ؟ دەفەرمووێ: بە صیلەی ڕەحم و شکاندنی بتەکان و بەندایەتیکردن بۆ الله بە تەنها و بەبێ هاوبەشدانان بۆی. ڕوونی کردۆتەوە کە کرۆکی پەیامی خوا و بانگەوازی پێغەمبەر بریتیە لە بەیەکدانانی الله لە بەندایەتیکردن بۆی بە تەنها و بەبێ هاوبەشدانان بۆی، وە شکاندنی بتەکان، وە مەعلومە شکاندنی بتەکان نایەتە دی تەنها بە دژایەتی کردنێکی توند و دەرهێنانی شمشێر نەبێت، جا وورد ببەوە لە کرۆکی پەیامەکە.

وە هەروەها لە فەرموودەکەدا هەیە کە "عمرو" لە مەبەستی تەوحید تێگەیشت، وە تێگەیشت کە "تەوحید" شتێکی زۆر گەورە و نامۆیە، جا بۆیە پرسی کێت لەگەڵدایە ؟ فەرمووی: ئازاد و کۆیلە "حر و عبد"، وەڵامی دایەوە کە هەموو زانایان و عابیدان و پاشایان و گشت خەڵکی پێچەوانەی ئەون و شوێنی نەکەوتوون لە پەیامەکەیدا، تەنها ئەوانە نەبێت کە باسی کردن "وەکو ئەبو بەکر و بیلال و عمار و چەند کەسێکی تر"، جا ئەمە ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حەق جاری وا لەگەڵ کەمترین ژمارەدا دەبێت، وە باطل زەوی پڕ دەکات.

چەندە جوانە ووتەکەی "الفضيل بن عياض" کە دەڵێ: "دڵتەنگ مەبە لە حەق بەهۆی کەمی ژمارەی ئەو کەسانەی حەقیان گرتۆتە بەر، وە هەڵمەخەڵەتێ بە باطل بەهۆی زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی بە هیلاک چوونە". وە جوانتریش لەوە وتەی الله تعالى یە کە دەفەرمووێ: **"ولقد صدق عليهم إبليس ظنه فاتبعوه إلا فريقا من المؤمنين"** واتا گومانی ئیبلیس لەسەریان بەڕاستی هاتەدی "کە ووتی سوێند بە عززەتی خوا هەموویان گومڕا دەکەم" جا زۆربەیان شوێنی ئیبلیس کەوتن تەنها کۆمەڵێکی کەم نەبێت لە

ئیمانداران. وه له "الصحیحین"دا هاتووه: {له ههر ههزار کهسێکدا نۆ سهد و نهوهد و نۆ کهسیان بۆ دۆزهخه}، (وه یهکێکیان بۆ بهههشته، جا کاتێک "هاوهڵان" ئهمهیان بیست گریان، پێغهمبهر "صلى الله عليه وسلم" فهرمووی: هیچ پێغهمبهرایهتیهک نهبووه ئیللا پێش ئهو جاهیلیهت ههبووه، جا ئهم ژمارهیه له کهسانی جاهیلیهوه دهنێردرێن بۆ دۆزهخ، ئهگهر ژمارهکهیان تهواو نهکرد ئهوا ژمارهکه تهواو دهکرێت به مونافیقان).

جا ئهگهر مرۆڤ وورد بوویهوه لهو شتانهی که لهناو ئهم فهرموودهدا ههیه دهربارهی چۆنیهتی دهست پێکی ئیسلام، وه ئهو کهسانه که شوێنی پێغهمبهر "صلى الله عليه وسلم" کهوتوون، پاشان ئهو فهرموودهیهی تری صهحیحی موسلیم لهگهڵی دابنێت که فهرموویهتی: "ئیسلام به غهریبی دهستی پێکرد، وه دووباره غهریب دهبێتهوه ههروهک چۆن سهرهتا غهریب بوو" ئهوا کارهکهی بۆ ڕوون دهبێتهوه گهر خوا هیدایهتی بدات و بیانوی فیرعهونی لهسهر لادهچێت که دهیوت **"فما بال القرون الأولى"** وه بیانوی قورهیشیهکان که دهیانوت **"ما سمعنا بهذا في الملة الآخرة"**.

(شهرحهکه بهکۆ تاهات).

**تێبینی وهرگێڕ:** (ئهمه دوو فهرموودهیه لهناو یهکتردا برگهی یهکهمیان که لهناو ئهم دوو کهوانه دایه { } بوخاری و موسلیم ڕیوایهتیان کردووه، وه برگهی دووهمیان که لهناو ئهم دوو کهوانهیه دایه ( ) الترمذي ڕیوایهتی کردووه، ئهگهر چی "الترمذي" دهربارهی حوکمی فهرموودهکه دهڵێ: "حديث حسن صحيح" ههروهک شێخیش ئاماژهی پێداوه له کتێبهکهیدا، بهڵام ڕیوایهتهکهی "الترمذي" سهنهدهکهی زهعیفه، بهڵام له صهحیحی بوخاریدا هاتووه به مانایهکی نزیک لهمهوه بهڵام باسی یأجوج ومأجوج دهکات لهبڕی مونافیقان).

وه (الشيخ سليمان بن عبد الله) رحمه الله، له چهند شوێنێکی کتێبی شهرحی تهوحید (تيسير العزيز الحميد) باسی ئهوه دهکات که ههرکهسێک ووشهی تهوحید (لا إله إلا الله) بڵێ و نوێژ بکات و زهکات بدات، بهڵام سهرپێچی ئهمه بکات به کردار و وتهکانی وهکو پاڕانهوه له پیاوچاکان و داوای به هاناوهچوون لێیان و سهربڕینی ئاژهڵ بۆیان، ئهوا ئهو کهسه هاوشێوهی یههود و نهصارایه له وتنیان بۆ ووشهی تهوحید و سهرپێچیکردنی (ووشهی تهوحید)، جا بهم پێیه بێت ئهو کهسهی که دهڵێت پێویسته ئیقامهی حوججه لهسهر موشریکان بکرێت، دهسهپێت بهسهریدا که بڵێت پێویسته ئیقامهی حوججه لهسهر یههود و نهصاراش بکرێت لهووتنیان بۆ ووشهی تهوحید و سهرپێچیکردنی (ووشهی تهوحید)، وه بهسهریدا دهسهپێت یههود و نهصارا کافر نهکات ئیللا دوای ئیقامهکردنی حوججه لهسهریان، ئهم شتهش زۆر ڕوونه ئهگهر ڕهچاوی (ئهم قسهیان) بکرێت. وه ووتهی الشيخ "عبداللطيف بن عبد الرحمن" رحمه الله، لهسهر ئهم بابهتهگهلێک زۆره، جا ئێمهش تۆزێکی لێ باس دهکهین، چونکه بابهتهکه یهکدهنگی لهسهره (واتا جێگای خیلاف نیه و ڕوونه) بۆیه شوێنهکه شوێنی کورت کردنهوهیه (واتا کورت کردنهوهی وتهکان).

باسی ئەو وتەیەی دەکەین دەربارەی ئەو گومانەی کە ئەو کەسە بە بەڵگە دەیهێنایەوە (مەبەستی داود بن جرجيس العراقي)ە، دەربارەی ئەو کەسەی کە گومەزی الكواز دەپەرستێ کەچی شێخیش (واتا محمد بن عبد الوهاب) دەوەستێت لە حوکمدانی کوفر بەسەریدا.

سەرەتا باسی چۆنیەتی هاتنی وەڵامەکە دەکەین وە لەبەرچیش ئەم وەڵامە هاتووە، ئەویش کە (الشيخ محمد بن عبد الوهاب) وە ئەو کەسانەی کە ئەم ووتەیەی الشيخ دەگێرنەوە (مەبەستی ئەو ووتەیە کە "الشيخ محمد بن عبد الوهاب" دەڵێ: "ئەو کەسەی کە گومەزی الكواز دەپەرستێ تەکفیری ناکەین چونکە کەس نەبووە ئاگاداری بکاتەوە لەم کارە واتا ئیقامە حوججەی لەسەر نەکراوە") وەکو عوزر هێنانەوە بۆ الشيخ باسی دەکەن، دەربارەی ئەوەی کە دوژمنانی الشيخ بانگەشەی ئەوە دەکەن کە الشيخ موسڵمانان تەکفیر دەکات، (واتا وەکو بەرگریکردنێک بۆ الشيخ ئەم وتەیە هاتووە، ئێوە دەڵێن الشيخ موسڵمانان تەکفیر دەکات کەچی ئەوەتا الشيخ دەڵێت ئەوە گومەزی الكواز بپەرستێ تەکفیری ناکەم ئیللا دوای ئیقامەی حوججە، کەواتە قسەکەتان زۆر دوورە لە ڕاستیەوە)، ئەگینا خودی ئەم وتەیە (کە دەڵێ ئەوەی گومەزی الكواز دەپەرستێ کافری ناکەین ئیللا دوای ئیقامەی حوججە) دەست نادات بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە بەڵکو خودی وتەکە پێویستی بە بەڵگە و شایەت هەیە لە قورئان و سوننەتدا، (لێرەدا قسەی الشيخ بۆمان نابێتە بەڵگە نەوەک لەبەر ئەوەی بە دڵی ئێمە نیە قسەکەی، بەڵکو لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی نیە بۆ قسەکەی، جا ئەمەیە مامەڵەی موسڵمانان لەگەڵ وتەی زانایاندا جا هەر یەکێکیان بێت، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر قسەکەی وەکو خۆی بە ڕووکەش "ظاهر" وەربگرین دەبێ ڕەتی بکەینەوە، بەڵام "الشيخ عبد اللطيف" لە کتێبی "منهاج التأسيس والتقديس" لە وەڵامدانەوەی گومانەکانی "العراقي" باسی ئەوە دەکات کە ئەم ووتەیەی "الشيخ محمد بن عبد الوهاب" مەبەست پێی حوکمی قیامەتە نەوەک حوکمی دونیا، واتا الشيخ لە دونیادا حوکمی کافریان بەسەردا دەدات، بەڵام لە قیامەتدا حوکمی کوفر و دۆزەخیان بەسەردا نادات، بەهۆی ئەوەی ئەوانە لە سەردەمێکدان وەکو سەردەمی ئەهلی فەترە وایە عیلم لەناویاندا بوونی نەماوە، جا حوکمی ئەهلی فەترەش ڕوونە کە کافرن لە دونیادا و لە قیامەتیشدا دەوەستین لە حوکمدان لەسەریان، کە قەوڵی ڕاست ئەوەیە تاقی دەکرێنەوە، "الشيخ عبد اللطيف"یش بە بەڵگەوە ئەم ووتانەی "الشيخ محمد بن عبد الوهاب" دەهێنێت ئەوە نەبێت لە خۆیەوە ئەم لێکدانەوانە بۆ ووتەکانی الشيخ بکات تاوەکو بیگونجێنێت لەگەڵ مەنهەجی ڕاستەقینەی ئیسلام، جا ئەوەی دەیەوێت زیاتر ڕۆشن بێت بۆی با بگەڕێتەوە سەر کتێبی "منهاج التأسيس والتقديس").

وە جگە لەمەش بەڵگەی تر هەن وەکو ئەو نامەیەی کە "الشيخ محمد بن عبد الوهاب" بۆ "عبد الله بن عيسى"ی ناردووە کە لە کتێبی "الدرر السنية"دا هاتووە کە تیایدا دەڵێ: "گەر لەبەر ئەوە نەبێت کە خەڵکی تاکو ئێستا شارەزای دینی پێغەمبەر نین و نایناسن، وە لەبەر ئەوە نەبێت کە خەڵکی ئەم بانگەوازەیان بەلاوە

قورسە چونکە ڕانەهاتوون لەسەری، ئەوا کارەکە بەشێوەیەکی تر دەبوو، بەڵکو سوێند بەو الله یەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، گەر خەڵکی شارەزای دین بن و بیناسن وەکو خۆی، ئەوا ئەوکات فتوام دەدا بە حەڵاڵ بوونی خوێنی "ابن سحيم" و هاوشێوەکانی وە واجب بوونی کوشتنیان هەروەک چۆن هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەری، وە لە دڵمدا هیچ نارەحەتیەک نەدەبوو بەرامبەر ئەم فتوایە، بەڵام گەر خوا ویستی لەسەر بێت ئەم بانگەوازە بگات ئەوا ئەوکات شتانێک دەردەکەون هەرگیز بە خەیاڵتاندا نەهاتووە".

(جا ڕوونە کە لەسەرەتادا الشيخ ئەم خەڵکەی پێ کافر بووە کە توشی شیرك بوونە بەڵام بەهۆی پێنەگەیشتنی عیلم پێیان و ڕاکێشانی خەڵکی بۆ بانگەوازەکەی وورده وورده ئەم شتانەی باسکردووە نەوەک هەمووی بەیەکەوە، سەیرکە ئێمەی موسڵمانیش لە ئێستادا ناتوانین ئەوەی لە دڵماندا هەیە هەمووی باس بکەین بۆ خەڵک تەنانەت بۆ کەسە نزیکەکانیشمان بەڵکو وورده وورده شتێک لەوێ و شتێک لێرە باس دەکەین، لەوانەشە تا دەمرین هەروا بمێنینەوە بەڵام الشيخ هەروا نەمایەوە، ئەوەتا ئەوەی دەیزانی هەمووی گەیاند بە وتە و کردارەوە بە تێپەڕبوونی کات).

جا هەرکەسێک خوا بەرچاوی ڕۆشن کردبێت و سەلامەت بوبێت لە دەمارگیری و گرنگی بە نامە و کتێبەکانی الشيخ دابێت، ئەوا دەزانێت بە زانینێکی پڕ لە دڵنیاییەوە کە الشيخ ئەم بابەتەی ڕوونکردۆتەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی تەواو و ڕەوێنەرەوە بۆ گومانەکان، وە تەکفیری کەسی دیاریکراویش دەکات (تكفير المعين) لە هەموو نامە و کتێبەکانیدا، وە لە حوکمی هیچ یەکێک لەمانە ناوەستێت، وە ئینجا دەگەڕێینەوە سەر وەڵامەکە (وەڵامی الشيخ عبد اللطيف) کە ئاماژەمان پێدا.

(الشيخ عبد اللطيف) دەربارەی ووتەی (العراقي) کە دەڵێ: "مەککە و مەدینە و دانیشتووانیانتان کافر کرد" (دیارە ئەوکات حاڵی ئەم دوو شارە و زۆربەی دانیشتووانیان وابووە) جا (الشيخ عبد اللطيف) باسی وتەکانی (العراقي) دەکات و وەڵامی دەداتەوە، تاوەکو الشيخ (واتا عبد اللطيف) دەڵێ: "(العراقي) ووتی: شتێکی مەعلومە کە ڕێگری کردن لە تەکفیرکردنی موسڵمانان ئەگەر هاتوو قسەیان لەسەر ئەم بابەتە کرد و هەڵەیان تێدا کرد ئەوا یەکێکە لە حەقترین مەبەستە شەرعیەکان، جا ئەو کەسە گەر ئیجتیهادی کرد و پێکای دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر هەڵەی کرد یەک پاداشتی بۆ هەیە، ووتەکەی (العراقي) بەکۆتا هات".

وە لە وەڵامی ئەم وتەیە دەوترێ: "ئەم وتەیە هەروەکو ئەو دەستکاری کردنەی پێشوویەتی بۆ دەقەکان (تحريف) هەروەک لەپێشوودا باسمان کرد، لەم ووتەیەیدا دوو تەحریف کردن هەیە. (سەرەتا ئەوە بزانین ئەم ووتەیەی کە "العراقي" باسی کرد ووتەی "شيخ الإسلام ابن تيمية"یە رحمه الله، واتا بەڵگە بۆ قسەکانی دەهێنێتەوە دەربارەی تەکفیرنەکردنی کەسی دیاریکراو بە ووتەکانی "ابن تيمية و ابن القيم"، پەنجا ووتەی ئەم دوو زانایەی کۆکردۆتەوە کە هەمووی دەربارەی بابەتی "تكفير المعين"ە، بەڵام زۆربەی ووتەکانی "ابن تيمية" وەڵامی پرسیارەکانی خەڵکیە کە لە "مجموع الفتاوى"دا هاتووە، بەڵام "العراقي" پرسیارەکانی لابردووە،

تەنها وەڵامەکانی "ابن تيمية"ی نەقل کردووە، تاوەکو خەڵکی نەزانن ئەمە وەڵامی چ پرسیارێکە بەمەش هەڵدەخەڵەتێن وادەزانن ئەمە ووتەی "ابن تيمية" دەربارەی بابەتی کوفر و شیرك، کە هەرکەسێک بە هەڵە تێیان کەوت ئەوا موجتەهیدە و پاداشتێکی بۆ هەیە!!! سبحان الله ئەوەی بە هەڵە بکەوێتە کوفر و شیرکەوە پاداشت وەردەگرێت!!! سەیری ئەم فێڵە و دەستکاری کردنەی "العراقي" بکەن بۆ ووتەکانی "ابن تيمية"، ئینجا ئێستا دێینەوە سەر ئەو دوو تەحریفەی "العراقي" کە "الشيخ عبد اللطيف" باسی دەکات).

**تەحریفی یەکەم:** (العراقي) پرسیارەکانی خەڵکی بۆ (شيخ الإسلام) لابردووە و نەقلی نەکردووە، (ابن تيمية) باسی خەواریج و رافیزە دەکات کە لە بابەتە خیلافیەکاندا موسڵمان و ئەهلی سوننەیان تەکفیرکردووە، لەبەر ئەوەی ئەوان دژی ئەم بیدعە و داهێنراوانەی ئەوانن کە خۆیان دایان هێناوە و کردوویانە بە بنچینە (ئەصل) و دین، جا (العراقي) ئەم ووتەیەی (ابن تيمية) قرتاندووە (واتا "ابن تيمية" دەڵێ: نابێت لە بابەتە خیلافیەکان کەس کافر بکرێت، بەڵکو ئەگەر زانایەک ئیجتیهادی کرد و پێکای دوو پاداشتی هەیە، وە ئەگەر نەیپێکا یەک پاداشتی هەیە، وە زەمی خەواریخ و رافیزە دەکات بەهۆی تەکفیرکردنیان بۆ ئەهلی سوننە لە بابەتە خیلافیەکانی نێوانیان، کەچی " العراقي" ئەم بەشەی دووەمی وەڵامەکەی قرتاندووە، تەنها بەشی یەکەمی هێناوە کە دەڵێ: نابێت کەس تەکفیر بکرێت ئەگەر هەڵەش بکات، بەڵکو یان دوو پاداشت یان یەک پاداشت وەردەگرێت کەسی هەڵەکەر، جا "العراقي" بە خەڵک دەڵێت سەیرکەن بزانن چۆن "ابن تيمية" دەڵێ: ئەوەی بە هەڵە بکەوێتە ناو کوفر و شیرکەوە نابێت تەکفیر بکرێت، بەڵکو پاداشتیش وەردەگرێت ئەگەر موجتەهید بێت، ئەمەیان لێ دەشارێتەوە کە ئەو باسی بابەتی خیلافی دەکات نەوەک کوفر و شیرك). بۆیە قرتاندوویەتی لەترسی ئەوەی کەس نەڵێت پارانەوە لە مردووان و داوالێکردنیان و هاوارکردنیان کە بە هانایانەوە بێن ئەمانە هیچی پەیوەندی بەو بابەتەوە نیە (کە ابن تيمية باسی کرد) وە موسڵمانان لەم بابەتەدا هیچ خیلافێکیان نیە (بابەتی شیرکی گۆڕپەرستان) بەڵکو ئەم بابەتە ئیجماعی لەسەرە کە شیرکێکی کافرکەرە (واتا شیرك و کوفری گەورەیە نەوەک بچووک)، هەروەک چۆن (شيخ الإسلام ابن تيمية) باسی کردووە، وە کردوویەتی بە بابەتێک کە هیچ خیلافێکی تێدانیە لە تەکفیرکردن، جا دروست نیە ئەم ووتەیەی (ابن تيمية) (دەربارەی هەڵەی موجتەهید کە پاداشت وەردەگرێت لە بابەتی خیلافی) بسەپێندرێت بەسەر بابەتێک کە کوفرێکی ئیجماع لەسەرە، گەر ئەم کارەی (العراقي) ڕاست بێت، ئەوا مانای وایە وتەکانی (ابن تيمية) پێچەوانەی یەکترن، بەڵام خوا پاکی ڕاگرتووە و ئەوی پاراستووە (لەوەی کە وتەکانی پێچەوانە و دژ بەیەک بن) وتەکانی وەکو یەکن و یەکێکیان دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوی تریان، جا کاتێک کە تەحریفی (العراقي)ت زانی لە قرتاندن و لابردنی هەندێک وتەی (ابن تيمية) ئەوا دەزانیت کە لابردنی هەندێک وتە وادەکات مانای وتەکە و ویستی خاوەنەکەی بگۆڕێت.

**تەحریفی دووەم:** (شیخ الإسلام ابن تیمیة) (لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە لێی کراوە کە "العراقي" قرتاندوویەتی دەربارەی تەکفیرکردنی زانایانی موسڵمان بووە وەکو "أبو حامد الغزالي" کە وتویەتی: پێغەمبەریش هەڵە دەکات، لەسەر ئەم قسەیە کەسێک تەکفیری کردووە)، (شیخ الإسلام) وتویەتی: ئەصلی تەکفیرکردنی موسڵمانان کاری خەواریج و رەوافیزە، وە (شیخ الإسلام) گۆڕپەرستانی دەرهێناوە لەوەی ناویان ببات بە ئیسلام (مسمی الإسلام، واتا بە موسڵمان حیسابیان ناکات، کەچی "العراقي" دڵی بەم ووتەیە خۆش کردووە دەڵێ: سەیرکەن بزانن "ابن تیمیة" دەڵێ: نابێت موسڵمانان تەکفیر بکرێن ئەگەر هەڵەیان کرد، ئێمەش دەڵێین: سەرەتا ئەو باسی موسڵمان دەکات نەوەک گۆڕپەرستان هەروەک "الشیخ عبد اللطیف" ووتی: "شیخ الإسلام" گۆڕپەرستان بە موسڵمان ناو نابات، دووەمیان: ئەو باسی هەڵە دەکات لە بابەتی فەرعی، نەوەک باسی شیرك و کوفری گۆڕپەرستان، واتا بە هیچ جۆرێک بەڵگە هێنانەوەت بەم ووتەیەی "ابن تیمیة" لە شوێنی خۆیدا نیە) هەروەک چۆن کۆمەڵێک لە ووتەکانی نەقل دەکەین دەربارەی ئەوەی کە (شیخ الإسلام) حوکم دەدات بەسەریان کە ئەوان نایەنە ناو بازنەی موسڵمان، جا (الشیخ عبد اللطیف) کۆمەڵێک ووتەی (ابن تیمیة) باس دەکات تاوەکو دەگاتە ئەوەی کە دەڵێ: "هەرکەسێک بڕوای وابێت کە مرۆڤێک خوایە یان هاواری مردووێک بکات وە داوای ڕزق و سەرکەوتن و هیدایەتی لێبکات یان تەوەکولی لەسەر بکات یان سوجدەی بۆ ببات، ئەوا داوای تەوبەی لێدەکرێت، گەر تەوبەی نەکرد لە ملی دەدرێت".

جا بەڵگە هێنانەوەی (العراقي) (بە وتەکانی ابن تیمیة) پوچەڵ بوویەوە و لە بناغەوە ڕما، چۆن نەهیکردن لە تەکفیرکردنی موسڵمانان وەکو نەهیکردن لە تەکفیری ئەوانە دادەنێ کە هاواری پیاوچاکان دەکەن و داوای بە هاناوەچوونیان لێدەکەن هاوبەش لەگەڵ الله، وە شتێک لە بەندایەتی بۆ پیاوچاکان ئەنجام دەدەن کە جگە لە الله هیچ شتێ شایەنی ئەم بەندایەتیە نیە، جا ئەمە باطلە (ئەم کارەی العراقي) بە دەقی قورئان و سوننەت و ئیجماعی زانایانی ئوممەت.

وە سەیر لە جەهلی (العراقي) دایە کە بەڵگە دەهێنێتەوە بەسەر نەیارانیدا بە هەمان بانگەشە (بانگەشەی ئەوەی گۆڕپەرستان موسڵمانن) وە بانگەشەش نابێتە بەڵگە، وە بانگەشەی (العراقي) بۆ موسڵمانیەتی گۆڕپەرستان پێویستی بە بەڵگەیەکی قەطعی هەیە لەسەر موسڵمانیەتیان، جا ئەگەر موسڵمانیەتی ئەوانی سەلماند، ئەوا ئەوکات ڕێگری دەکرێت لە تەکفیرکردنیان، وە بابەتی فەرعیش کێشەی لەسەر نیە، وە مەعلومیشە هەر کەسێک موسڵمانان کافر بکات بەهۆی هەوا و ئارەزوویەوە وەکو خەواریج و ڕافیزە، یان کەسێک کافر بکات کە هەڵەی کردووە لە بابەتێکی ئیجتیهادی چ أصولی بێت یان فروعی، جا ئەم کەسە و هاوشێوەکانی بیدعەچی و گومڕان (واتا ئەوانەی کە تەکفیری ئەمانە دەکەن)، پێچەوانەی ئەوەن کە ئیمامەکانی هیدایەت و شێخەکانی دین لەسەری بوونە، وەکو: شیخ الإسلام (محمد بن عبد الوهاب) کەس کافر ناکات بەهۆی ئەم شتانەوە، بەڵکو ئەو کەسێک کافر دەکات کە قورئان و فەرموودەی صەحیح

تەکفیریان کردووە، وە ئوممەت ئیجماعی هەیە لەسەر تەکفیرکردنی، وەکو: ئەوانەی دینیان گۆڕیوە و هەمان کاری جاهیلیەکانیان ئەنجامداوە لە بەندایەتیکردنی پێغەمبەران و فریشتەکان و پیاوچاکان و هاوارکردن لێیان، خوا ئەمانەی کافر کردووە و خوێن و ماڵ و منداڵ و ژنیانی حەڵاڵ کردووە، بەهۆی بەندایەتیکردنیان بۆ پێغەمبەرێک یان وەلیێک (ولي) یان بتێک، جیاوازی لە نێوانیاندا لە کوفردا (واتا بەندایەتی بۆ کامەیان بکەی هەر کوفرە) هەروەک چۆن قورئان و کۆمەڵێک فەرموودەی زۆر باسیان کردووە، وە ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە دێتە پێشەوە، وە هەندێکیشمان باسکرد.

وە (الشيخ عبد اللطيف) دەڵێ: پرسیار لە (الشيخ محمد بن عبد الوهاب) کرا دەربارەی ئەم جاهیلانە (واتا گۆڕپەرستان) ئەویش ووتی: "ئەگەر ئیقامەی حوججەیان لەسەر کرابێت و ئەهل بن بۆ تێگەیشتنی ئیقامەی حوججە، ئەوا کافر دەبن بە پەرستنی گۆڕ" (کە دەڵێ ئەهل بن بۆ تێگەیشتنی ئیقامەی حوججە، واتا عاقڵ و بالغ بن، چونکە شێت و منداڵ ئیقامەی حوججەیان لەسەر ناکرێت و تێناگەن، چونکە لەم دووانەدا تێگەیشتن وەک مرۆڤی ئاسایی نیە بەهۆی لە دەستدانی عەقڵ و کەمی عەقڵ، سەبارەت بەوەش کە دەڵێ ئەوا کافر دەبن، مەبەستی ئەوە نیە ئەگەر شێت و منداڵ گۆڕیش بپەرستن هەر موسڵمانن و کافر ناکرێن لە دونیا ئیللا دوای ئیقامەی حوججە، بەڵکو مەبەستی حوکمی قیامەتە لەوێدا عوزریان هەیە و کافر ناکرێن، بەڵام لە دونیادا حوکمی کوفریان بەسەر دەدرێ، بەڵام نابێت بکوژرێن تاوەکو ئەو عوزرەی هەیانە لادەچێت کە ئەویش بە عاقڵ بوون و بالغ بوون لادەچێت)، بەڵام ئەو کەسەی دونیای هەڵبژاردووە و خۆی پێوە لکاندووە و دەست بەرداری نابێت و شوێنی هەوا و ئارەزووی کەوتووە نازانم حاڵی چۆنە، (واتا نازانم حاڵی چۆنە لە قیامەتدا و حوکمی قیامەتی لەسەر نادەم، بەڵام بۆ حوکمی دونیا ئەوا حەتمەن کافرە، جا ئەگەر ئەم کارەی ببێتە هۆی ئەوەی لە دونیاشدا کافر نەکرێت، ئەوا ئەوکات باوەش کردنەوە بۆ دونیا و پشت کردن لە عیلم و قیامەت دەبێتە هۆکاری ڕزگاربوونی خەڵکی لە کوفر، ئەم قسەیەش کەسێکی عاقڵ نایکات، چ جای ئەوەی زانایەکی گەورەی نوێکەرەوەی دینی وەکو "الشيخ محمد بن عبد الوهاب" بیکات)، وە لە پێشوودا باسی وتەکانیمان کرد دەربارەی ئەم بابەتە کە بەسیەتی (واتا بەسیەتی بۆ ئەوەی تێبگەین لە مەنهەجی "الشيخ محمد بن عبد الوهاب" کە کێ و چۆن تەکفیردەکات و چۆن باسی ئیقامەی حوججە و تێگەیشتن و پێگەیشتنی دەکات...هتد)، ئەمە لەکاتێکدا کە (العلامة ابن القيم) رحمه الله، بڕاندوویەتیەوە کە ئەوانەی تەقلیدی شێخەکانیان دەکەنەوە لە بابەتە کوفریەکاندا ئەوا کافرن ئەگەر توانای داواکردنی حەق و فێربوونی حەقیان هەبێت و ئەهلی ئەوە بن بەڵام پشت بکەن و ئاوڕی لێنەدەنەوە (واتا کەسەکە توانای فێربوونی عیلمی هەبێت و کەڕ نەبێت کە نەبیستێ و شێت نەبێت کە تێنەگات و منداڵ نەبێت کە جیاوازی نەکات و پیرێکی خڵەفاو نەبێت کە عەقڵی ناتەواو بێت بەڵام پشت لە فێربوونی حەق بکات یان کوێرانە شوێنی چەند زانا و شێخێک بکەوێ ئەوا کافرە لە دونیا و قیامەتدا)، (بەڵام نەخوێندەواری عوزر نیە بۆ دایک و باوک و داپیرە و باپیرانمان و هیچ کەسێک، ئایا هاوەڵان بە خۆیان و خێزانیان و منداڵەکانیان هەموویان خوێندەوار

بوون ؟ ئەگەر دەڵێی ئەوان پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" لەگەڵیاندا بوو حاڵیان جیاوازبوو، پێت دەڵێم: گەر تۆ و باوک و باپیرت لەناو پەرستنی لات و عوززادا ژیابن، دواتر پیاوێک دەرکەوێت بڵێ من پێغەمبەرم پەرستنی لات و عوززا کوفرە و خوا بە تەنها بپەرستن، ئایا تۆ وەکو هاوەڵان شوێنی دەکەویت و بە ماڵ و منداڵ و گیانت خۆت فیدای ئەو و دینەکەی دەکەی هەروەک چۆن هاوەڵان کردیان ؟ یان دەبیتە یەکێک لە سەرانی قورەیش و پیاوانی قورەیش ؟ دواتر ئەم قسەیەی تۆ ئەوپەڕی بێ ڕێزییە بەرامبەر هاوەڵان، وە بە درۆ خستنەوەی ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرە، واتا ئەوەی ئەوان کردیان هیچ ئازایەتیەکی تێدانیە منیش پێغەمبەرم لەگەڵ بوایە هەر ئاوا دەبووم، ئەی بۆچی الله تعالى دەفەرمووێ: ئەوانەی لە پێش فەتحی مەککە ماڵ و سامانیان بەخشی و جیهادیان کرد یەکسان نین لە پاداشتدا لەگەڵ ئەوانەی کە دوای فەتحی مەککە ماڵ و سامانیان بەخشی و جیهادیان کرد، ئەوانەی پێش فەتحی مەککە پلەی بەرزتریان هەیە، وە خوا موژدەی بەهەشتی بە هەردووکیان داوە **{الحديد : 10}**، وە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" کاتێک "خالد بن الوليد رضي الله عنه" جنێوی دا بە "عبد الرحمن بن عوف رضي الله عنه"، فەرمووی: جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، هەر یەکێک لە ئێوە بە قەدەر چیای ئوحد زێڕ ببەخشێ ناگاتە بەخشینی مشتێکی دەستی هاوەڵانم یان نیوەی مشتێکی. ئەمە لەکاتێکدا "خالد" هەشت مانگ بوو موسڵمان ببو، وە "عبد الرحمن" یەکێک بوو لەو هەشت کەسەی کە سەرەتا موسڵمان بوون لە مەککە، وە هەروەها هیجرەتی حەبەشە و مەدینەی کردووە، سەیرکە چۆن خوا فەزڵی ئەوانەی داوە کە پێش فەتحی مەککە بەخشین و جیهادیان کردووە بەسەر ئەوانەی دوای فەتحی مەکە بەخشین و جیهادیان کردووە، وە سەیرکە چۆن پێغەمبەری خوا دەڵێ جنێو بە هاوەڵانم مەدەن لەکاتێکدا خالید و عبد الرحمن هەردووکیان هاوەڵینە، بەڵام فەزڵی عبد الرحمن ی داوە بەسەر خالید دا، وە هەروەها فەزڵی بەخشینی ئەوانی داوە بەسەر ئەوانی دوای ئەوان، وە سەیرکە بزانە چۆن هەر دە موژدە پێدراوەکەی بەهەشت (أبو بكر و عمر و عثمان و علي و طلحة و زبير و عبد الرحمن بن عوف و سعد بن أبي وقاص و سعيد بن زيد و أبو عبيدة بن الجراح) رضي الله عنهم، ئەو کەسانەن کە لە سەرەتای هاتنی پێغەمبەردا موسڵمان بوونە و لە (السابقين الأولين)دان، جا ئێستا بۆت دەرکەوت فەزڵی ئەوانی سەرەتا چەندە زۆرن بەسەر دوای خۆیاندا سەرەڕای نەخوێندەواری زۆرینەیان).

جا ئەمانەی کە (ابن القيم) باسی کردن ئەگەرچی هیچیش عیلمیان پێ نەگات ئەوا هەر کافرن و ئیقامە حوججە کراون چونکە دەزانن قورئان هەیە و فەرموودە هەیە، بەڵام هیچ بەدوای عیلمدا ناگەڕێن و ئاوڕی لێنادەنەوە وەکو ئەوەی بڵێی ئەمە کاری ئەوان نیە، وە ئەوانەشی کە کوێرانە دوای زانا و شێخەکانیان کەوتوون بەبێ خۆ ماندوو کردن و گەڕان بەدوای ڕاستی و ناڕاستی وەکو ئەوانەن کە لە قیامەتدا دەڵێن : **{رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا}**.

وه ئەوەی توانای ئەوەی نەبێت و ئەهلی ئەوە نەبێت کە فێربێت پێغەمبەران بەچی ڕەوانە کراون، ئەوا ئەم کەسانە لەلای (ابن القيم) وەکو کەسێکی ئەهلی فەترە وایە، کە بانگەوازی هیچ پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانی پێ نەگەیشتووە (واتا لە دونیادا بە کافر دادەنرێن، بەڵام حوکمی قیامەتیان بەسەردا نادەین، لەوێدا تاقی دەکرێنەوە)، وە هەردووک جۆریان (ئەوانەی توانای فێربوونیان هەیە و هەوڵی فێربوون نادەن، وە ئەوانەش کە هیچیان پێ نەگەیشتووە وەکو ئەهلی فەترە وان) حوکمی ئیسلامیان بەسەر نادرێت و نایەنە ناو بازنەی موسڵمانان، تەنانەت لەلای ئەو کەسانەش کە جۆری یەکەم بە کافر دانانێن لە قیامەت، ناڵێن ئەو کەسانە موسڵمانن لە دونیادا، وە ووتەکانی (ابن القيم) دێینە سەری.

بەڵام ناوی شیرك بەسەریاندا دەدرێت و دەیانگرێتەوە (هەردووک جۆرەکە)، جا چ ئیسلامێک دەمێنێتەوە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی ئەصل و قاعیدە گەورەکەی کە شەهادەی لا إله إلا الله یە ؟ مانەوەی ئیسلام و ناوی موسڵمان لەسەر هەندێک کەس کە فەقیهەکان باسیان کردووە لە (باب حكم المرتد) (لە کتێبە فقهیەکاندا) ڕوونترە لەوەی لەسەر کەسانێک بمێنێتەوە کە پیاوچاکان دەپەرستێت و لێیان دەپاڕێتەوە (واتا ئەگەر بڵێین ئەو کەسەی گۆڕپەرستە و پیاوچاکان دەپەرستێ هەر بە موسڵمانی دەمێنێتەوە، ئەوا ئەو کەسانەی کە فەقیهەکان لە کتێبە فقهیەکاندا لە "باب حكم المرتد" باسیان کردوون، وەکو ئەو کەسەی ئینکاری واجب بوونی پێنج نوێژەکە بکات یان ئینکاری واجبی ڕۆژوو بکات...هتد ئەوا ئەو کەسانە شایستە ترن کە هەر بە موسڵمانی بمێننەوە، جا بڕوانە گەر کەسێک ئینکاری واجب بوونی پێنج نوێژە و زەکات بکات ناوی بچێتە ناو مورتەددانەوە، ئەی ئەو کەسەی جگە لە الله دەپەرستێ و هاوار لە غەیری الله دەکات ئەو چۆن بە موسڵمان حیساب دەکرێت !!!).

(پوختەی ووتەکانی "ابن القيم" ئەوەیە: ئەوەی توانای فێربوونی هەیە و پشت دەکات لە فێربوون کافرە لە دونیا و قیامەتدا، وە ئەوەی توانای فێربوونی نیە کافرە لە دونیادا بەڵام حوکمی قیامەتی بەسەردا نادەین وەکو ئەهلی فەترە وان).

بەڵام (العراقي) ڕادەکات لەوەی کە ئەم شتە ناو ببات بە (عیبادەت و دوعا)، وا دادەنێت کە ئەم شتە (توسل و بانگ کردن)ە، وە بە شتێکی (مستحب)ی دەزانێت (سبحان الله ئەوەی شیرك بکات کارێکی موستەحەبی کردووە چاکەی بۆ دەنوسرێت بە گوێرەی قسەی "العراقي" بێت !!!) ئای چەندە دوورە (ئەو شتەی کە العراقي بۆی چووە) "أين المفر والإله الطالب *** قد حيل بين العير والنزوان" (ئەمە دێڕە شیعرێکە الشيخ عبد اللطيف هێناویەتی)، بەوەی کە خوا منەتی کردووە (بەسەر بەندەکانی) لە کتێبەکەیدا کە هیچ کەسێک ناتوانێت شتێکی باطلی بۆ زیاد بکات و وە بە باطل شتێکی لێ کەم کاتەوە یان دەستکاری بکات و بیگۆڕێت، هاتۆتە خوارەوە لەلایەن زاتێکی حەکیم لە کردار و ووتە و ویستەکانی و ستایشکراو لە کردار و ووتە و

ویستەکانی (ئایەتی 42ی سورەتی فصلت) وە ئەوەشی کە لە (محمد) هاتووە کە بەندە و نێردراویەتی لە حیکمەت و هیدایەت و ڕوونکردنەوەی سنوورەکانی خوا کە داییەزاندووە بەسەریدا، وە بە بەردەوامی الله سبحانە وتعالی بۆ ئەم دینە کەسانێک پێدەگەیەنێت و گەشەیان پێدەدات کە بەڵگەکانی خوا لەسەر بەندەکانی بەرپا دەکەن و جیهاد دەکەن لە پێناوی ڕوونکردنەوەی دینەکەیی و شەرعەکەی لە دژی ئەو کەسانەی کە مولحیدن بەرامبەر کتێبەکەیی و دینەکەی وە دەیانەوێ مانای شتەکان لەشوێنی خۆیدا بگۆڕن بۆ شتێکی تر، تا کۆتایی ئەوەی باسی کرد.

(جا لێرەدا "الشیخ إسحاق" هەمان قسەکانی پێشووی "الشیخ عبد اللطیف" دووبارە دەکاتەوە کە وەڵامی "العراقي" پێدەداتەوە لە کتێبی "منهاج التأسیس والتقدیس" هەروەک چۆن پێش ئێستا هەموومان باسکرد بە هەمان شێوە دووبارەی دەکاتەوە بە پیت و ووشەوە ، وە دەڵێ: لە ووتەکانی "الشیخ عبد اللطیف" وورد بینەوە، بۆیە من نەمویست هەمان ئەم ووتانە دووبارە بکەمەوە تاوەکو زیاتر درێژ نەبێتەوە بابەتەکە وە لەبەر ئەوەی ووتەکان هەمان ئەم ووتانەی پێشوون هیچ شتێکی زیاتری تێدا نیە تەنها ئەم برگەی کۆتایی نەبێت کە بۆتانی نەقل دەکەم، ئەویش ئەمەیە کە دەڵێ): الشیخ عبد اللطیف کۆمەڵێک ووتەی (ابن تیمیة) باس دەکات تاوەکو دەگاتە ئەوەی کە دەڵێ: "هەرکەسێک بڕوای وابێت کە مرۆڤێک خوایە یان هاواری مردووێک بکات وە داوای ڕزق و سەرکەوتن و هیدایەتی لێبکات یان تەوەکولی لەسەر بکات یان سوجدەی بۆ ببات، ئەوا داوای تەوبەی لێدەکرێت، گەر تەوبەی نەکرد لە ملی دەدرێت، (شیخ الإسلام) نەیووت ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت، وە نەیووت تەکفیر ناکرێت تاوەکو ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت، هەروەک چۆن ئەو کەسەی کە هیچ عیلمێکی نیە وا گومان دەبات، وە ئەو کەسە هەر لە ئەصلی دینەکەیەوە لێی تێکەڵ بووە".

ووتم (واتا الشیخ "إسحاق" وادەڵێ) : ئەمە ڕوونترین شتە کە وەڵامی ئەو ووتەیەی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب)ی پێ بدرێتەوە کە دەڵێ: "ئەو جاهیلەی کە گومەزی الکواز دەپەرستێ کافری ناکەین"، چونکە (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) عوزری بۆ کەس دانەناوە نە جاهیل نە غەیری جاهیلیش، ئەمەش مەنهەجی قورئانە کە بریتیە لە تەکفیرکردنی هەرکەسێک کە شیرک ئەنجام دابێت، وە وەستانی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله، لە هەندێک وەڵامیدا (مەبەستی وەستانیەتی لە حوکمدان بە کوفر لە هەندێک لە وەڵامی نامەکانیدا) وا لێک دەدرێتەوە کە لەبەر هۆکارێک لە هۆکارەکان بووە (واتا "الشیخ محمد بن عبد الوهاب" ئەصلی بابەتەکەی ڕوون کردۆتەوە بە جوانی لە کتێب و نامەکانیدا، بەڵام لە هەندێک شوێن کە دەڵێ ئەوەی شیرك ئەنجام بدات تەکفیری ناکەین ئیللا دوای ئیقامەی حوججە، ئەوا هۆکاری خۆی هەیە، چونکە کە حوکمێک جێبەجێ دەکەیت لە واقیعدا جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە بە نەزەری باسی دەکەیت، لەوانەیە ئەو کەسە عوزری شەرعی هەبووبێت بۆیە وەستاوە لە تەکفیرکردنی، وە لەوەش ڕوونتر وتەکانی "الشیخ عبد اللطیف"ە کە گومانەکانی سەر ئەم ووتانە دەڕەوێنێتەوە کە دەڵێ: "الشیخ محمد بن عبد الوهاب" کە دەڵێ

تەکفیریان ناکەن ئیللا دوای ئیقامەی حوججە، مەبەستی تەکفیری قیامەتە نەوەک تەکفیری دونیا، واتا لە دونیادا تەکفیری دەکات، بەڵام حوکمی قیامەتی بەسەر نادات، هەروەک لە پێشوودا ئاماژەمان پێدا")، وە هەروەها دەبینی کە (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) بە هەمان شێوە لە شوێنێکی تر وەستاوە لە حوکمدان بە کوفر کە دەڵێ: "ئەو کەسەی دونیای هەڵبژاردووە و خۆی پێوە لکاندووە و دەست بەرداری نابێت و شوێنی هەوا و ئارەزووی کەوتووە نازانم حاڵی چۆنە".

یا الله چەند سەیرە! چۆن ووتەکانی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) لە هەموو شوێنەکاندا بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و وتەکانی (شیخ الإسلام و ابن القیم) وازی لێدەهێنرێت کە دەڵێ: "هەرکەسێک قورئانی پێبگات ئەوا ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە" کەچی ووتەیەکی ئەو قبوڵ دەکرێت لە شوێنێکدا کە بە گشتی باسی کردووە بەبێ ڕوونکردنەوە (واتا موجمەلە، موفەصەل نیە).

وە هەروەها بە زیرەکیەوە بڕوانە وتەکانی (ابن القیم) کە (الشیخ "عبد اللطیف) نەقلی کرد لە وەڵامدانەوەی بۆ (العراقي) (مەبەستی ئەو دوو جۆرەیە کە "ابن القیم" باسی کرد و حوکمی لەسەردان، کە تۆزێک پێش ئێستا باسمان کرد، پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات چونکە نوسراوە لە سەرەوە).

با باسی ووتەکانی (ابن القیم) بکەین (لە کتێبی طریق الهجرتین وباب السعادتین) لە بەشی (طبقات المكلفين) (باسی پلە و پایەی چینەکان دەکات، وە کردوویەتی بە هەژدە چینەوە) کە (الشیخ عبد اللطیف) نەقلی کردووە لە (ابن القیم)ەوە، بۆ وەڵامدانەوەی (العراقي) وەکو تەفسیرێک بۆ ئەو شتانەی کە باسمان کرد، وە بۆ ئەوەی ببێتە هۆکاری لابردنی پاشماوەی گومانەکان.

(ابن القیم) رحمه الله، لە بەشی (طبقات المكلفين)دا کاتێک باسی سەرانی کوفری کرد ئەوانەی کە خەڵکی هەڵدەگێڕنەوە لەسەر ڕێگای خوا، وە باسی ئەوەی کرد کە سزای ئەمانە چەندبارەیە، پاشان ووتی: "چینی حەڤدەیەم: چینی تەقلیدکەرەوەکان و کافرە جاهیلەکان و شوێنکەوتووانیان و کەرەکانیانن ئەوانەی کە شوێنکەوتووی ئەوانن، کە دەڵێن: ئێمە باوک و باپیرانمان لەسەر ئەم دینە بینیوە، وە ئێمەش شوێنی ئەوان دەکەوین و شوێن پێی ئەوان دەگرینە بەر".

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە سەلامەتن بۆ موسڵمانان و شەڕیان لەگەڵدا ناکەن، وەکو ژن و خزمەتکار و شوێنکەوتووی دژایەتیکەران وان (واتا دژایەتیکەرانی ئیسلام و موسڵمانان)، ئەمانە وەکو ئەم دژایەتیکەرانە خۆیان تەرخان نەکردووە بۆ هەوڵدانی کوژاندنەوەی نوری خوا (کە دینەکەیەتی) و ڕماندنی دینەکەی و نەهێشتنی وتەکانی، بەڵکو ئەمانە وەکو ئاژەڵ وان، جا ئوممەت یەکدەنگە لەسەر ئەوەی کە ئەم چینە کافرن،

ئەگەرچی جاهیلیش بن و تەقلیدکەرەوەی سەرۆکەکان و ئیمامەکانیان بن، تەنها ئەوە نەبێت کە باس دەکرێت کە هەندێک ئەهلی بیدعە حوکمی چوونە دۆزەخ بەسەر ئەم چینەدا نادەن، بەڵکو وەکو ئەهلی فەترە حیسابیان دەکەن، وە ئەم مەزهەبەش (واتا ئەم قسەیە) هیچ یەکێک لە ئیمامەکانی موسڵمانان نەیووتوە، نە هاوەڵان، نە تابعین، نە دوای ئەوانیش، بەڵکو ئەم وتەیە هی هەندێک کەسی (ئەهلی کەلام)ی داهێنراون لە ئیسلام، (سەیرکە بزانە چۆن زەمی ئەو کەسانە دەکات کە حوکمی چوونە دۆزەخ نادەن بەسەر ئەو کەسانەی کە جاهیلن و تەقلیدکەرەوەن، ئەی دەبێت چی بڵێت بەوانەی کە لە دونیاشدا حوکمی کوفریان بەسەر نادەن ؟)،وە بە صەحیحی لە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" هاتووە کە فەرموویەتی: "هیچ لە دایکبووێک نیە ئیللا لەسەر فیطرەت (واتا ئیسلام) لە دایک دەبێت، جا دایک و باوکی دەیکەن بە یەهودی یان نەصرانی یان مەجوسی" (بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە)، پێی وتین کە دایک و باوکی منداڵەکە دینی منداڵەکەیان لە ئیسلامەوە دەگۆڕن بۆ یەهودی یان نەصرانی یان مەجوسی، باسی هیچ شتێکی تری نەکردووە تەنها ئەوە نەبێت کە پەروەردە دەبێت و پێی دەگات لەسەر ئەوەی کە دایک و باوکی لەسەرینە (واتا ئەصلی بابەتەکە دینی دایک و باوکیەتی دینی ئەوان چی بێت دینی منالەکەش ئەوەیە، بەڵام پێویستە ئەوە بزاندرێ کە ئەم حوکمە حوکمی دونیای زاهیرییە "ڕووکەش" نەوەک حوکمی قیامەتی حەقیقی، واتا لە دونیا بە کافر دادەنرێن بەڵام لە قیامەت قەولی ڕاست ئەوەیە تاقی دەکرێنەوە)، وە بە صەحیحی لە پێغەمبەر"صلى الله عليه وسلم" هاتووە کە دەفەرمووێ: "ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە نەفسی موسڵمان" (بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە)، وە ئەم تەقلیدکەرەوەیەش موسڵمان نیە، وە عاقڵ و تەکلیف لەسەرە، وە عاقڵێش لە ئیسلام و کوفر دەرناچێت (واتا دەبێت یەکێکیان بێت)، بەڵام ئەو کەسەی کە بانگەوازی پێنەگات (وەکو ئەهلی فەترە بێت) تەکلیفی لەسەر نیە لەم حاڵەتەدا، وەکو منداڵ و شێت حیسابی بۆ دەکرێت، کە پێشتر باسمان کردن (لە چینی چواردەیەم "ابن القيم" باسی منداڵ و شێتە کافرەکان دەکات و دەڵێ قەولی ڕاست ئەوەیە لە قیامەتدا تاقی دەکرێنەوە، وە بە یەکدەنگی زانایان لە دونیادا کافرن).

ووتم (واتا الشيخ "إسحاق" وادەڵێ) : "ئەم چینە مەبەستم ئەوانەیە کە بانگەوازیان پێنەگەیشتووە، ئەو چینەن کە (شيخ الإسلام ابن تيمية) عوزری پێداون کە (العراقي) نەقلی کرد لێیەوە، وە شێخەکەمان (محمد بن عبد الوهاب)یش رحمه الله، عوزریان پێدەدات". (دیسان دەیڵێمەوە مەبەستی حوکمی قیامەتە نەوەک حوکمی دونیا، تکایە هۆشیار بن و ووتەی زانایان جەمع بکەن نەوەک بەیەکی دابدەن بیکەن بە پێچەوانەی یەکتر).

(ابن القيم) دەڵێ: "ئیسلام بریتیە لە بە یەکدانانی خوا و بەندایەتیکردنی بە تەنها و بەبێ هاوبەش، وە باوەڕبوون بە پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی لەو شتانەی کە پێی هاتووە، جا هەر بەندەیەک ئەم شتانە ئەنجام نەدات ئەوا موسڵمان نیە، جا ئەگەرچی کافرێکی عیناد نەبێت بەڵام کافرێکی جاهیلە، جا

ئەم چینە کافری جاهیلن بەبێ ئەوەی عینادی بکەن، بەڵام عینادی نەکردنیان دەربازیان ناکات لە کافر بوون، چونکە کافر ئەو کەسەیە کە ئینکاری تەوحیدی خوا دەکات و پێغەمبەرەکەی بە درۆ دەخاتەوە یان بە عینادی یان بە جاهیلی و تەقلیدکردنەوەی عینادکەران، جا ئەمە ئەگەرچی عیناد نیە بەڵام شوێنکەوتووی ئەهلی عینادە، وە خوا لە قورئاندا لە چەند شوێنێک پێی ڕاگەیاندووین دەربارەی سزای ئەوانەی تەقلیدی پێشینە کافرەکانیان دەکەنەوە، وە شوێنکەوتووان دەبێتە مشتومڕیان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە شوێنیان کەوتبوون لەناو ئاگری دۆزەخدا، پاشان چەند ئایەتێک و فەرموودەیەکی لەسەر ئەمە هێنا و پاشان ووتی (واتا ابن القیم) : "ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفری شوێنکەوتووانیان تەنها لەبەر شوێنکەوتن و تەقلیدکردنەوەیانە". (ابن القیم دەڵێ) : بەڵێ بێگومان دەبێت لێرەدا ڕوونکردنەوە بدەین بۆ ئەوەی کێشە و گومانەکان لا ببات، ئەویش جیاوازی کردنە لە نێوان تەقلیدکەرێک کە توانای فێربوونی عیلمی و زانینی حەق هەیە بەڵام پشتی تێدەکات، وە تەقلیدکەرێک توانای هیچ لەمانەی نیە بەهیچ شێوەیەک، وە هەردووک جۆرەکە بوونیان هەیە لە واقیعدا، جا تەقلیدکەری پشتێکەر (لە فێربوونی عیلم) ئیهمالە و وازی لە واجبی سەرشانی هێناوە (کە فێربوونی عیلمە، حەتمەن بە کردار پێکردنەوە) هیچ عوزرێکی نیە لەلای خوا، بەڵام ئەو تەقلیدکەرەی کە توانای داواکردن و فێربوونی عیلمی نیە بەهیچ شێوەیەک، ئەوا دوو جۆرە:

**یەکێکیان:** داوای هیدایەت دەکات و پێشی خستووە بەسەر هەموو شتێکدا و خۆشی دەوێت، بەڵام توانای دەستکەوتنی (عیلمی) نیە، وە توانای داواکردنی (عیلمی) نیە چونکە کەس نیە ڕێنموونی بکات، جا ئەمە حوکمی وەکو حوکمی ئەهلی فەترە و ئەوانە وایە کە بانگەوازیان پێنەگەیشتووە.

**دووەمیان:** پشتێکەرە (لە فێربوونی عیلم) هیچ ویستێکی نیە (بۆ فێربوونی عیلم) وە لە دڵی خۆیدا باسی فێربوونی عیلم ناکات و هیوای پێ ناخوازێت، لە دڵی خۆیدا هەر ئەوە هەیە کە خۆی لەسەریەتی (واتا لە دڵی خۆیدا ناڵێت چەند خۆشە یەکێک هەبێت فێرە عیلمم بکات و داوای فێربوونی عیلمی لێ بکەم و شارەزا بم لە دین و لەم جاهیلیەتە ڕزگارم بێت، بەڵکو ئەمەی هەر بە دڵدا نایەت، هەر بەوە ڕازییە کە خۆی لەسەریەتی، ئەگەر عیلم بخرێتە ژێر دەستیشی هەروەک خۆی دەمێنێتەوە و داوای ناکات، وەکو زۆرینەی خەڵکی ئەم سەردەمە وەکو من و تۆ دەزانێت قورئان هەیە و بە هەزارەها تەفسیر و فەرموودە و شەرحی فەرموودە و کتێبی عەقیدەیی و فقهی ...هتد هەیە، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان بە دڵی دانایەت بڵێ چەند خۆشە بیخوێنمەوە و فێریان بم وەکو ئەوە وابێت کە ئەمە کاری ئەو نەبێت، ئەو تەنها بۆ پێنج نوێژەکە و ڕۆژووی رمضان دروستکراوە، جا ئەم جۆرە کەسانە چ لەو حاڵەی ئێستا تیایدانە کە عیلم هەیە و عالیم هەیە لەبەر دەستیان بەڵام داوای ناکەن، لەگەڵ ئەو حاڵەی کە بخرێنە بیابانێکی چۆڵەوە و کەس پێیان نەگات جیاوازی چیە ؟ لە هەردوو حاڵەتدا ئەوەی بیری لێنەکەنەوە فێربوونی عیلمە، لێرە و لەوێش هەر پشتێکەرن).

جۆری یەکەمیان دەڵێ: ئەی پەروەردگارا گەر بزانم تۆ دینێکت هەیە باشترە لەوەی کە من لەسەریمە، ئەوا دەچمە سەر ئەو دینەت و واز لەو دینە دەهێنم کە لەسەریمە، بەڵام جگە لەو دینەی کە من لەسەریمە هیچ دینێکی تر ناناسم، وە جگە لەوە توانای هیچ شتێکی ترم نیە، ئەمە ئەوپەڕی تێکۆشان و توانای فێربوونمە.

وە جۆری دووەمیان: ڕازییە بەوەی کە لەسەریەتی (ئەو دین و عەقیدە و مەنهەجەی کە لەسەری دەڕوات)، هیچ شتێک پێش ناخات بەسەریدا، وە نەفسەکەی جگە لەوەی کە لەسەریەتی هیچ شتێکی تر داوا ناکات، (ئەم کەسە) هیچ جیاوازییەکی نیە چ لەحاڵەتی نەبوونی توانای فێربوون چ لەحاڵەتی هەبوونی توانای فێربوون، وە هەردووکیان بێ توانان لە فێربوونی عیلم (واتا هەردووک جۆرەکە توانای فێربوونی عیلمیان نیە، بەڵام یەکێکیان گەر بێتو عیلمی پێبگات وەری دەگرێت، بەڵام ئەوی تریان ئەگەر عیلمیشی پێبگات هەر ئاوڕی لێناداتەوە و پشتگوێی دەخات واتا لە هەردوو حاڵەتدا هەر ویستی فێربوونی نیە)، جا جۆری دووەمیان ناکرێت وەکو جۆری یەکەم دابنرێت بەهۆی ئەو جیاوازییەی لەنێوانیاندا هەیە.

**جۆری یەکەم** وەکو ئەوە وایە لە سەردەمی فەترە (هیچ پێغەمبەرێک و پەیامێک بوونی نەبێت) داوای فێربوونی دین بکات و پێی نەگات، جا لە دین لادات بەهۆی بێ توانایی و جاهیلی بەڵام دوای سەرفکردنی تێکۆشانی لە پێناو داواکردنی فێربوونی دین.

**جۆری دووەم** وەکو ئەوە وایە کە هەر داوای فێربوونی دین نەکات، بەڵکو مرد بێت لەسەر شیرکەکەی، وە ئەگەرچی داواشی کردبێت بێ توانا بووە لە وەرگرتنی، جا جیاوازی هەیە لەنێوان بێ توانایی ئەو کەسەی کە داوای فێربوون دەکات لەگەڵ بێ توانایی ئەو کەسەی پشت دەکات لە فێربوون، جا وورد ببەوە لەم بابەتە.

خوا حوکم دەکات لەنێوان بەندەکانی لەڕۆژی قیامەتدا بە عەدالەت و حیکمەتی خۆی، وە سزای هیچ کەسێک نادات تەنها ئەوە نەبێت کە ئیقامەی حوججەی لەسەر کراوە بە نێردراوەکانی، ئەم شتە بڕاوەتەوە دەربارەی دروستکراوەکانی بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام ئەوەی کە ئایا خودی (زید) یان خودی (عمرو) ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە یان نا ؟ ئەمە شتێکە لە نێوان خوا و بەندەکانیدا ناتوانین تەدەخولی تێدا بکەین (لە کتێبە فقهیەکاندا کە نموونە بهێننەوە بە کەسێک ئەوا هەمیشە بە ناوی "زید و عمرو" دەیهێننەوە، جا ئەوەی لێرەدا "ابن القیم" مەبەستیەتی ئەوەیە: کە ئەگەر کەسێک کافربوو کوفرمان لێ بینی بەڵام نەمانزانی ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە یان نا، ئەوا لە دونیادا حوکمی کوفری بەسەردا دەدەین چونکە کوفرمان لێ بینیوە، بەڵام حوکمی قیامەتی بەسەردا نادەین واتا ناڵێین دەچێتە دۆزەخەوە یان تاقی دەکرێتەوە چونکە نازانین ئیقامە حوججەی لەسەرکراوە یان نا، بەڵام کەسێک کوفری لێ ببینین و وە بزانین ئیقامەی حوججەی لەسەرکراوە، ئەوا حوکمی کوفری دونیای بەسەردا دەدەین و وە حوکمی چوونە دۆزەخیشی بەسەردا دەدەین گەر لەسەر ئەم کوفرەی مرد بێت، وە ئەگەر کوفری لێ ببینین و وە بزانین ئیقامەی

حوججەی لەسەر نەکراوە، ئەوا حوکمی کوفری دونیای بەسەردا دەدەین، وە دەڵێین لە قیامەتدا تاقی دەکرێتەوە).

بەڵکو واجبە لەسەر بەندە کە عەقیدەی وابێت کە هەرکەسێک دینێکی غەیری دینی ئیسلام بکات بە دینی خۆی، ئەوا کافرە، وە خوا سزای هیچ کەسێک نادات تەنها دوای ئیقامە حوججە لەسەری بە پێغەمبەر، ئەمە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام دەربارەی سەپاندنی حوکمی قیامەت بەسەر یەکە یەکەدا ئەوەیان عیلمەکەی دەگێڕینەوە بۆلای خوا، ئەم حوکمە دەربارەی حوکمی پاداشت و سزایە، بەڵام حوکمی دونیا بەگوێرەی ڕووکەش (ظاهر) دەبێت، جا منداڵ و شێتەکانی کافران حوکمیان کافربوونە لە دونیادا، هەمان حوکمی دایک و باوکیان هەیە لە دونیادا، جا بەم ڕوونکردنەوەیە گومان لادەچێت لەسەر ئەم بابەتە، کە ئەمەش بنیات نراوە لەسەر چوار ئەصل:

**ئەصلی یەکەم:** خوا هیچ کەسێک سزا نادات تەنها دوای ئیقامەی حوججە نەبێت لەسەری، هەروەک الله تعالی فەرموویەتی: {وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا} {الإسراء : 15}، وە فەرموویەتی: {رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ} {النساء : 165}، وە چەند ئایەتێکی تری باسکرد، پاشان ووتی: الله تعالی فەرموویەتی: {وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ} {الزخرف : 76}، وە زاڵمیش ئەو کەسەیە کە بزانێت پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" بەچی نێردراوە، یان بتوانێت فێرببێت کە بە چی نێردراوە، پاشان سەرپێچی پێغەمبەر بکات یان پشت بکات لە فێربوونی ئەوەی کە پێی هاتووە، بەڵام ئەو کەسەی ئەصلەن هیچ عیلمێکی لەلا نیە دەربارەی پێغەمبەر، وە ناتوانێت پێغەمبەر بناسێت بەهیچ شێوەیەک وە بێ توانا بێت لە ناسینی، جا ئەم کەسە چۆن پێی دەوترێ زاڵم ؟.

**ئەصلی دووەم:** سزای خوا بە دوو شت دەبێتە شایەنی هەرکەسێک، یەکەمیان: پشت تێکردن لە بەڵگە (حوججە : قورئان و سوننەت) وە نەویستنی فێربوونی و وە نەویستنی کارپێکردنی، دووەمیان: عینادی کردنی بەڵگەکان دوای بەرپاکردنی حوججە لەسەری، وە وازهێنان لە ویستنی کارپێکردنی، جا یەکەمیان کوفری پشتێکردنە وە دووەمیان کوفری عینادی کردنە، بەڵام کوفری جەهل لەگەڵ نەبوونی ئیقامەی حوججە و توانای فێربوونی، ئا ئەمەیانە کە خوا سزای نادات ئیللا دوای ئیقامە حوججە لەسەری بەهۆی پێغەمبەرانەوە.

**ئەصلی سێیەم:** ئیقامەی حوججە دەگۆڕێت بە گۆڕانی کات و شوێن و کەسەکان، ئیقامەی حوججەی خوا لەسەر کافران دەکرێت لە سەردەمێکدا وە ناکرێت لە سەردەمێکی تردا، وە لە شوێن و جێگایەکدا دەکرێت

وە ناكرێت لە شوێن و جێگایەكی تردا، وە هەروەها لەسەر كەسێكدا دەكرێت وە ناكرێت لەسەر كەسێكی تردا، جا چ بەهۆی نەبوونی عەقڵ و جیانەكردنەوەی شتەكان بێت وەكو منداڵ و شێت یان بەهۆی تێنەگەیشتنی بێت كە وەرگێڕ (مترجم) لەوێ نەبێت بۆی وەربگێڕێت (واتا بە زمانی غەیری خۆی ئیقامەی حوججەی لەسەر بكرێت)، جا ئەم كەسە وەكو كەڕ وایە هیچ نابیستێت و ناتوانێت تێبگات، ئەمەش یەكێكە لەو چوار جۆر كەسەی كە لەلای خوا عوزریان هەیە لەڕۆژی قیامەتدا هەروەک لە فەرموودەی (الأسود و أبي هريرة) و جگە لەوانیش هاتووە (مەبەستی ئەم فەرموودەیە كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: چوار جۆر كەس هەن لەڕۆژی قیامەتدا عوزریان هەیە، كەسێكی كەڕ كە هیچ نابیستێ، وە كەسێكی گێل "وەكو شێت" وە كەسێكی پیری خەڵەفاو، وە كەسێک كە لە سەردەمی فەترەدا مردووە، جا كەڕەكە دەڵێ پەروەردگار كاتێک ئیسلام هات من هیچم نەدەبیست، وە گێلەكە دەڵێ پەروەردگار كاتێک ئیسلام هات منداڵان قشپلیان بۆ دەهاویشتم "قشپل : پیسایی مەڕ و ماڵات و ووشترە"، وە پیرە خەڵەفاوەكە دەڵێ پەروەردگار كاتێک ئیسلام هات من هیچ تێنەدەگەیشتم، وە ئەوەی لە سەردەمی فەترەدا مردووە دەڵێ پەروەردگار هیچ نێردراوێک لەلایەن تۆوە بۆم نەهات، ئینجا خوا پەیمانیان لێوەردەگرێت كە گوێڕایەڵی بكەن، جا پێیان دەڵێت بڕۆنە ئاگری دۆزەخەوە، فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی "محمد"ی بە دەستە گەر بچووبانە ناویەوە ئەوا سارد و سەلامەت دەبوو لەسەریان. وە فەرموودەیەكی تری نزیک لەمە هەیە كە "أنس" ڕیوایەتی كردووە، كە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: چوار جۆر كەس دەهێنن لەڕۆژی قیامەتدا، منداڵ و عەقڵ ناتەواو و پیرێكی خەڵەفاو و ئەوەی مردووە لەسەر دەمی فەترە، هەریەكەیان باسی عوزرەكەی دەكات، جا پەروەردگار تبارك وتعالى بە ملێک لە ئاگردا دەڵێ دەركەوە، جا پێیان دەفەرمووێ: من پێغەمبەرم لە نەفسی خۆتان بۆ ڕەوانە دەكردن، جا من ئێستا نێردراوی خۆمم بۆ ئێوە بڕۆنە ناو ئەم ملە ئاگرەوە، جا ئەوانەی هەر لە سەرەتاوە دۆزەخی بوونە دەڵێن: پەروەردگارا چۆن بچینە ناویەوە لەكاتێكدا ئێمە لە ئاگر ڕامان كردووە، وە ئەوانەشی هەر لە سەرەتاوە بەهەشتی بوونە بەخێرایی بەرەو ئاگرەكە دەڕۆن و دەچنە ناویەوە، ئینجا الله تعالى پێیان دەفەرمووێ "بەوانەی كە نەچوونە ناو ئاگرەكەوە" ئێوە گەر پێغەمبەرم بۆتان ڕەوانە كردبوایە زیاتر بە درۆتان دەخستەوە و سەرپێچیتان دەكرد "واتا ئەوەتا من قسەتان لەگەڵ دەكەم و پەیمانم لێوەرگرتوون گوێڕایەڵیم ناكەن، ئەی چۆن گوێڕایەڵی پێغەمبەرانتان دەكرد ئەگەر بۆتان هاتبوایە" ؟).

(فەرموودەی یەكەم "ئیمام أحمد" و فەرموودەی دووەم "أبو يعلى" ڕیوایەتیان كردووە و بەكۆی ڕێگاكانیان دەبنە فەرموودەیەكی حەسەن چونكە فەرموودەی زۆری تر شایەتن بۆ ئەم دوو فەرموودەیە).

**تێبینی:** الشيخ "إسحاق" ئەصلی چوارەمی نەقل نەكردووە لە نامەكەیدا كە "ابن القيم" باسی ئەوە دەكات كە هەموو كردەوەكانی خوا بەگوێرەی حیكمەتیەتی، سبحانه وتعالى هیچ كردەوەیەكی نیە بێ حیكمەت بێ. (منیش بە كورتی هێناومە).

پاشان الشيخ (واتا عبد اللطيف) رحمه الله، ووتی: لێرەدا هەڵوەستە بکە و وورد ببەوە لەم ڕوونکردنەوە جوانە، ئەو (واتا ابن القيم) عوزری بە کەس نەداوە تەنها ئەوە نەبێت کە توانای فێربوون و پێگەیشتنی بە حەق نەبووە لەگەڵ ئەوپەڕی داواکردن و هەوڵدان و ویست هەبوون بۆی، جا ئەم جۆرە کەسانە مەبەست پێیانەوە لە ووتەکانی (شيخ الإسلام و ابن القيم) و هاوشێوەکانیان (واتا کە دەڵێن تەکفیر ناکرێت تاوەکو ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت مەبەستیان ئەم جۆرە کەسەیە کە هەموو هەوڵێک دەدات بۆ فێربوونی عیلم بەڵام دەستی ناکەوێت، کەچی لە دونیادا هەر بە کافر دادەنرێت بەڵام لە قیامەتدا عوزری هەیە و بە کافر دانانرێت و سزا نادرێت بەڵکو تاقی دەکرێتەوە، تاقی کردنەوەکەش وەکو ئیقامەی حوججە وایە بۆیە دوای تاقی کردنەوەکە دەچێتە بەهەشتەوە یان دەچێتە دۆزەخەوە)، بەڵام (العراقي) و برایەکانی کە لەسەر باطلن، گومان بۆ خەڵکی دروست دەکەن کە الشيخ (مەبەستی ابن تيمية یان محمد بن عبد الوهاب)ە، کەسی جاهیل تەکفیر ناکات، وە دەڵێت ئەم کەسە عوزری هەیە، جا ووتەکە بە موجمەلی باس دەکەن و ڕوونی ناکەنەوە (واتا بەبێ ڕوونکردنەوە وەکو ئەوەی نەوەکانی شێخ ڕوونیان کردەوە بە موجمەلی باسی دەکەن و نایکەن بە موفەصەل)، جا ئەم گومانەیان کردووە بە قەلغانێک بۆ ڕەتکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر، وە هێرش دەکەنە سەر (بە زمان، وە بە کرداریش گەر بۆیان بڕەخسێ) بەندە موەحیدەکانی خوا، هەروەک چۆن پێشینەکانی خۆیان لە گۆڕپەرستان وایانکردووە، وە چارەنووس و گەڕانەوە هەر بۆلای خوایە، وە ئەو حاکمە لەنێوان بەندەکانیدا لەو شتانەی کە خیلاف هەیە لەنێوانیاندا... تاوەکو کۆتایی کە الشيخ (عبد اللطيف) باسیکردووە رحمه الله.

(الشيخ إسحاق دەڵێ): جا وورد ببەوە گەر تۆ یەکێکی لەوانەی داوای حەق دەکات بە بەڵگەوە، وە ئەگەر تۆ یەکێکی لەوانەی کە لەسەر باطل سوورە و دەیەوێ بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر شتە باطیلەکانی پشت بە ووتە موجمەلەکانی زانایان ببەستێ ئەوا هیچ سەیر نیە (واتا هیچ سەیر نیە توشی گومڕایی و کوفر و سەرلێشێواوی بیت و خەڵکیش توش بکەیت).

وصلى الله على محمد النبي الأمي وعلى آله وصحبه أجمعين.

## *** کۆتایی ***

مانگی "ذي الحجة"ی ساڵی "1312"ی کۆچی، نەقل کراوە لەسەر دەست و خەتی نوسەر (واتا الشيخ إسحاق) رحمه الله تعالى، جا خوا پاداشتی خێری بداتەوە بەرامبەر ئەو کارەی کە لە خزمەتی ئیسلام و موسڵماناندا کردوویەتی.

# بە پێنوسی "عبد العزيز الفوزان"

(عبد العزيز الفوزان ئەو کەسەیە کە ئەم نامەیەی کۆپی کردووە لەسەر دەست و خەتی الشيخ "إسحاق" هەروەک لە پێشەکی ئەم نامەیەشدا ئاماژەم پێداوە، جا خوا پاداشتی شێخ ئیسحاق و ئەویش بداتەوە بە خێر، لەگەڵ شيخ الإسلام ابن تيمية و ابن القيم و محمد بن عبد الوهاب و عبد اللطيف).

جا لەکۆتاییدا بە (أهل الإرجاء والتجهم) دەڵێم سەیرکەن چۆن نەوەکانی (الشیخ محمد بن عبد الوهاب) تێگەیشتوون لە کتێب و نامە و نوسراوەکانی شێخ محمد و تەواوی ئیمامەکانی بانگەوازی نەجدی (الأئمة الدعوة النجدیة) چۆن گومانەکانی سەر وتەکانی (الشیخ) لادەدەن و هەڵیدەوەشێننەوە، کەچی ئێوەش کە ناوتان لە خۆتان ناوە سەلەفی کە تەنها بانگەشەیە و حەقیقەتی نیە، بەشێوەیەکی تر دەڕوانن لە وتەکانی (الشیخ محمد) و نەوەکانی، ئەمە لەکاتێکدا تەواوی کتێب و نامە و نوسینەکانیان خۆتان چاپی دەکەن و بڵاوی دەکەن و شەرحی دەکەن بە کتێب و بە دەنگ، جا حەق بدەن بە خەڵکی موسڵمان بەهۆی شەرحی نەوەکانیەوە لە وتەکانی (الشیخ) بگەن یان بەهۆی شەرحی ئێوە لە وتەکانی (الشیخ) بگەن ؟؟؟ ئایا نەوەکانی بەهەڵە تێگەیشتن لە ووتەکانی (الشیخ) بەڵام ئێوە وەکو خۆی تێیگەیشتوون ؟؟؟

وە بە خوشک و برایانی موسڵمان (موحد) دەڵێم : با سوپاسی خوا بکەین کە دەبینین کەسانێک هەمیشە وانە و شەرحی کتێبەکان دەخوێنن و بانگەشەی سەلەفیەت دەکەن و هەمیشە دەرگای مزگەوت و ماڵی زانایان بۆیان کراوەیە کەچی توشی گومڕایی و کوفر بوونە، کەچی من و تۆی موسڵمان بەم هەموو ئاستەنگ و کۆسپەی کە دەخرێتە پێشمان بۆ فێربوونی عیلمی شەرعی، کەچی سوپاس بۆ الله تعالی بە فەزل و منەتی خۆیەوە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلامی ڕاستەقینە.

وصلی الله علی نبینا محمد وعلی آله وصحبه أجمعین.